لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق
«دەستەی کورد»

# زانستی ناوەڵواتا

لە ڕەخنەسازیی یۆنانی و ڕۆمانی و عەرەبی و ئەورووپییەوە
بۆ ڕەخنەسازیی کوردی

دانانی
**دکتۆر کامل حسن عزیز البصیر**
ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری عێراق

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق
١٩٨١ ز ١٤٠١ ک

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق
„دەستەی کورد“

# زانستی ئاوەڵواتا

## لە ڕەخنەسازیی یۆنانی و ڕۆمانی و عەرەبی و ئەورووپییەوە
## بۆ ڕەخنەسازیی کوردی

دانانی
دکتۆر کامل حسن عزیز البصیر
ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری عێراق

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق
١٩٨١ ز    ١٤٠١ ك



# پێشەکی

ووشە لە ڕووی ژمارەوە لە هەموو زمانێکدا سنووری هەیە و لە بن دێت ، بە پێچەوانەی واتاوە کە هەرگیزاوهەرگیز کۆتایی نایەت و هەمیشە لە پەرەسەندندایە • ئەم ڕاستی‌یە وای لە میللەتان کردووە هەندێ ووشە لە زمانەکانیاندا بۆ دوو واتا یان زیاتر بە کاربهێنن •

لە زانستی زمان و هونەری ڕەوانبێژیشدا [1] ئەو ووشانە بە چەشنێکی تایبەتی باس‌دەکرین و لێیان دەکۆڵرێتەوە • بۆنموونە : لە زمانی لاتینی و زمانە زیندووەکانی ئەوروپایی لە ژێر ناونیشانی میتەفۆردا Metaphore زاناکانی «ڕیتۆرك» [2] شی‌یان دەکەنەوە و لە زمانی عەرەبی‌دا شارەزاکانی زانستی ڕەوانبێژی بە ناوی مەجاز لێکیان دەدەنەوە سەرئەنجام ئەو ووشەیەی کە بۆ واتایەکی نوێ لە زمانی لاتینی و زمانە زیندووەکانی ئەوروپادا بە کاردێت پێی دەوترێ میتەفۆر Metaphore و لە زمانی عەرەبی‌دا بە مەجاز ناو دەبرێ • هۆی ئەو ناوبردنە و ئەم ناودانانە لەوەوە هەڵقولاوە کە گوایە ووشەکە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر گواستراوەتەوە •

---

(١) ڕەوانبێژی : البلاغة .

(٢) ڕیتورن : ڕەوانبێژی .

ئەوانەی لە زمانی کوردی خۆیان لە قەرەی ئەم بابەتە داوە لەسەر هەمان ڕێچکە ڕۆیشتوون و شوێن پێی شارەزا عەرەبەکانیان هەڵگرتووە و ئەو چەشنە ووشانەیان ناو ناوە خوازە یان خواستە : واتە ووشەیەك لەو ووشانە بۆ واتایەکی نوێ خوازراوە یان خواستراوە •

پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە : ئایا ڕاستە کە ووشە لە واتاکەیەوە بۆ واتایەکی تر گواستراوەتەوە و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە هەڵگیراوە ؟ ! •

بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستمان لەم پرسیارە با نموونەیەك بۆ ووشەیەکی (میتەفۆر ، مەجاز ، خوازە و خواستە ) بهێنینەوە :ـ

لە زۆربەی زمانەکاندا بۆ پیاوی ئازا ووشەی (شێر) بە کاردێت و لە جیاتی ئەوەی بووترێ : «پیاوێکی ئازام دی» دەڵێن «شێرێکم لە بازاڕ دی» ، بۆیە ووشەی «شێر» دوو واتای هەیە : واتای یەکەم ، ناوێکە بۆ دڕندەیەکی ئازا • واتای دووەم ئاوەڵناوێکە بۆ ئادەمیزادێکی بە جەرگ • کەوابوو ووشەی «شێر» لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر نەگواستراوەتەوە بەڵکوو لە خۆیدا دوو واتای پێکەوە لکاوی هەیە :

بێ گومان واتای یەکەمی سەرەکییە ، واتای دووەمیشی لەم واتا سەرەکییەوە هەڵقولاوە و بۆ ئادەمیزادێك کە لە ڕووی ئازایەتیەوە لە شێر بچێت گونجێندراوە • بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین کە زاراوەی خوازە و خواستنی لاسایی‌کەرەوەی کوردی ناتوانن سروشتی ئەم ڕووداوە زمانی و هونەرییە دەربڕن و ڕوونی بکەنەوە • جا بۆمان هەیە کە پشت لەو زاراوانە بکەین لە جیاتی یان زاراوەی «ئاوەڵواتا» بەکاربهێنین ، چونکە واتای ئازایەتی بۆ ووشەی (شێر) هەمیشە لەگەڵ واتا سەرەکیەکەیەتی و بە

هیچ کلۆجێك لێی جیانابێتەوە و گوێ گر کە ئەم ووشەیە دەبیستێ یەکسەر واتای ئازایەتی و ناوی ئەو دڕوندەیە پێکەوە بە مێشکیدادێن •

هەرچۆنێك بێ «زاراوەی ئاوەڵواتا» ـ لە نێوانی زانستی زمـان و ڕەخنەسازی‌دا ـ بابەتێکی هاوبەشە و باسێکی ئێجگار گرنگە و لە زمان و ڕەخنەسازیی کوردی‌دا پیویستی بە لێکۆڵینەوە یەکی ئەکادیمی لەبەر تیشکی ڕێبازێکی زانستی و هونەریدا هەیە •

ئەم پێویستیە پاڵی پێوە نام لەم کۆڕە بێ‌سنوورەدا تەقەللایەك بدەم و ئەم لێکۆڵینەوەیە پێش‌کەش بە خوێنەری کورد بکەم :

نەخشەی ئەم لێکۆڵینەوەیش بۆ ئەوەی مێژوویی بێت لە چوار بەشی سەرەکی پێك‌هاتووە :

بەشی یــەکەم :

تێ‌ڕوانینێکی گشتی‌یە دەربارەی میتەفۆر لە ڕەخنەسازیی یۆنانی و ڕۆمانیدا •

بەشی دووەم :

سەرنجێکە لە ڕەخنەسازیی عەرەبی بۆ دەست‌نیشان‌کردنی چۆنیەتی باسی مەجاز لە لایەن زاناکانی ڕەوانبێژیی عەرەبی‌یەوە •

بەشی سێ‌یەم :

پیاچونەوەیەکە لەگەڵ چەند ڕەخنەسازێکی ئەورووپی هاوچەرخ بــۆ دەست‌نیشان‌کردنی گۆڕانەکانی باسی میتەفۆر لەسەردەمی دێرینەوە هەتاکو ڕۆژگاری ئێستەمان •

بەشی چوارەم :

لێکدانەوەی باسی (خوازە)یە لە لای ئەو زانا کوردانە کە لەم باسەدا

ئیشیان کردووه لەگەڵ چەسپاندنی بیروڕا تایبەتیەکانماندا لەم ڕووەوە .

هیوادارم کە توانیبێتم خزمەتی زانستی زمان و ڕەخنەسازی کوردیم بەم لێکۆڵینەوە کورتە کردبێت ، هەرچەندە لەو باوەڕەدام لێکۆڵینەوەکەم لە کەموکوڕیەوە دوور نیە ، چونکە سەرەتایەکە و هەموو سەرەتایەکیش پێویستی بە ڕابەری و خستنە سەر هەیە بۆ ئەوەی نەشونما بکات و ئامانجەکانی بهێنێتەدی .

**سلێمانی**
**دکتۆر کامل حسن عزیز البصیر**
**١٩٧٩/١١/٢٢**

# بەشی یەکەم

## میتەفۆر لە رەختەسازیی یۆنانی و رۆمانیدا

ـ سۆفستاییەکان و زانستی میتەفۆر •

ـ فەرامۆش‌کردنی میتەفۆر لە نێوانی سۆکرات و ئیفلاتۆندا •

ـ ئەرستۆ و لێکۆڵینەوەی میتەفۆر •

ـ ووشە و واتا لەلای هۆراس‌دا •

ـ لۆنجینۆس و دەربڕینی میتەفۆر •

# مینەفۆر لە ڕەخنەسازیی یۆنانی و ڕۆمانیدا

سەرەتای زانستی مینەفۆر لە ڕەخنەسازیی یۆنانیدا :

مێژوونووسەکان بە گشتی دەڕواننە وێژەی یۆنانی و ڕۆمانی ، تەمەنی ئەم وێژەیە بە سەر حەوت قۆناغدا * دابەش دەکەن :

**قۆنـاغی یـەکەم :**

سەردەمی ئەفسانەیی . لە پێش تۆمارکردنی مێژووەوە هەتا کۆتـایی سەدەی نۆیەمی پێش زایین .

**قۆنـاغی دووەم :**

سەردەمی قارەمان و شەڕ و شۆڕەکان لە کۆتایی سەدەی نۆیەمی پێش زایینەوە هەتا نزیکەی نیوەی سەدەی شەشەمی پێش زایین .

**قونـاغی سێهەم :**

سەردەمی شارستانیەتی ، لە نیوەی سەدەی هەشتەمی پێش زایینەوە هەتا سەدەی پێنجەمی پێش زایین .

**قۆنـاغی چوارەم :**

سەردەمی ئەثینی ، لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینەوە هەتا سـەدەی سێیەمی پێش زایین .

---

* بڕوانە کتێبی (دراسات فی النقد الادبی) ل (٤٢-٤٣) .

**قۆنـاغی پێنجەم :**

سەردەمی ئەسکەندەری ، لە سەدەی سێیەمی پێش زایینەوە هەتـا ساڵی سەد و چل و شەشی زایین •

**قۆنـاغی شەشەم :**

سەردەمی یۆنانی و ڕۆمانی لە نێوانی ساڵی سەد و چـل و شـەشی زایینی و ساڵی سێسەد و سیی زایین‌دا •

**قۆنـاغی حەوتـەم :**

سەردەمی بیزەنتی لە ساڵی سێسەدو سیی زایینی‌یەوە هەتـا سـاڵی هەزار و چوارسەد و پەنجـا و سێی زایینی کـە عوسمانیـەکان شـاری کوستەنتینی‌یەیان داگیرکرد •

وێژەی یۆنانی و ڕۆمانی بەم دابەشکردنە پچڕپچڕ نیە و بەرهەمـی هەر قۆناغێکی وەکوو دوڕگەیەکی سەربەخۆ نایەتە بەرچاو ، بەڵکو هەمیشە یەکێتیی قەوارەی خۆی پاراستووە و ئەڵقەکانی زنجیرەیەکی یەکگرتووە •

ئەوەی لەم ڕاستی‌یە پێوەندی بە لێکۆڵینەوەکەمانەوە هەبێت : قۆناغی سەردەمی ئەفسانەیی‌یە ، کە بنکەی قۆناغەکانی ترە ، چونکە بەرهەمەکانی ئەم قۆناغە لە داستانە میثۆلۆجیەکان و چیرۆکە میتافیزیکی یەکان دەربارەی خواکان ڕەنگیان لە کارەکانی قۆناغەکانی تری وێژەی یۆنانی و ڕۆمـانی‌دا داوەتەوە و وێژەرە یۆنانی و رۆمـانی‌یەکان لـە هەموو سەردەمـەکاندا ئەفسانەکانیان وەکوو سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ بەرهەمەکانیان داناوە •

ڕەنگدانەوەی ئەفسانە لە وێژەی یۆنانی و ڕۆمانیدا بە لای ئێمـەوە سەرچاوەی پەیدابوونی زانستیی میتەفۆرە لـە رەخنەسـازیی ئـەم دوو نەتەوەیەدا •

بەڵگەشمان ئەوەیــە :

میللەتی یۆنان بۆ هەر هێزێکی سروشت و ئارەزوویەکی دەروون و چالاکییەکی ئادەمیزاد خوایەکیان ، داتاشیوە [1] و جڵەوی هەموو ئیش و کارێکی پەنهان و ئاشکرایان داوەتە دەستیەوە • سەرئەنجام پەیکەریان بۆ زیاتر لە سی و حەوت خوا لە پەرستگا و میانەکانیان بەرزکردۆتەوە :

ئەم خوایانە بە گوێرەی میثۆلۆجیەکانیان بەسەر دوو خێزاندا پۆل‌پۆل دەکرێــن :

خیزانی (کرۆنۆس) یان (ساتۆرن) ، خیزانی (زۆس) یاخود (جۆبیتێر)• لە وەچەکانی (جۆبیتێر) خواکانــی نــۆ هونــەرەکانن : (یوارنی) Uronie خوای زانست و Clio (کیلیو) خوای ئەستیرەگەری و ، (کیلیو) Clio خوای زانست و مێژوو و ، (یوتیرب) Euterpe خوای موسیقــا ، و تربیسیکــور Terpsichore خوای سەما و (ثالی) Thalie خوای کومیدیا و (ملپومین) Melpomene خوای تراجیدیاو (اراتوا) Arato خوای هۆنراوەی لاوانەوە و خەفەت و (پۆلمنی Polymnie ) خوای هــۆنراوەی گورانیَ و (کلّیوپ) Calliope خــوای هــۆنراوەی جۆشــدان کە ئەرکێکی گرنــگ لە زانیاری و زانست و ئایین و فەلسەفە و وێــژەی یۆنانی دەگێڕن • جا بۆ ئەوەی پێوەندیی ئەم ئەرکە بەزانستی میتەفۆرەوە دەست‌نیشان بکەین با سەرنج لە داستانی ئەلیــاذە [2] بدەیــن و بزانــین

---

(١) بڕوانە کتێبی (الادب الیونانی القدیم ل ١٣ــ٢٤ •

(٢) ووشەی (ئەلیاذە) نیسبەیەکی یۆنانی‌یە بۆ شاری (ئەلیۆن) پایتەختــی ترواد‌ییەکان ، ئەم ووشەیە لە مێژووی وێژەی یۆنانی‌دا بۆ هۆنراوەیەکی داستانی کە هەستیاری بە ناوبانگی یۆنانیەکان (هۆمیرۆس) لە نیــوەی سەدەی نۆیەمی پێش زایین‌دا کۆی‌کردۆتەوە و ڕێکی خستووە و لــە قالبێکی هونەری‌دا دای‌ڕشتووە .

هۆمێروس [٣] چلۆن باسی خواکان دەکات ؟ •

هۆمیرۆس دەڵی : «خواکان لە لوتکەی ئۆلۆمپدا میرنشینی‌یەکی شاهانەیان پێکهێناوە :

سەرۆکی ئەم میرنشینی‌یە « تەزۆسە » • خواکان هەموویان لە وێنەی ئادەمیزاددان ، بەڵام نەمرن ، چونکە شلەیەکی تایبەتی لە لەشیاندا هەیە لە قارەمانەکان بە هێزتر و خێراترن چۆن بیانەوێ بۆ خەڵکی دەردەکەون یاخود خۆیانیان لێ‌دەشارنەوە • لە تەلاری بەرز و جوان لە ئاسماندا دەژین ، هەموو ژیانیان بەختیاری و بەهارە • دەخۆن و دەخۆنەوە و ژن و ژن‌خوازی دەکەن ، ڕم و تیر برینداریان دەکات ، ئازار دەچێژن و دەگرین• دەست دەخەنە ناو ئیش‌وکاری ئادەمیزادەوە • هەندێکیان پشتگیری یۆنانی‌یەکان دەکەن و هەندێکی تریشیان لایەنی ترواددییەکان دەگرن • جوێن بە یەکتر دەدەن و فێڵ لە یەکتر دەکەن • دەست لەو مرۆڤە دەپارێزن کە بە قوربانی و دیاری لێیان نزیك دەبێتەوە [٤] » •

ئەم چەشنە باسە ، کە زۆربەی هەستیار و نوسەرە دراماتیکی‌یەکان و تراجیدی و کۆمیدی نووسەکان لەسەر ڕێچکەی ڕۆیشتبوون ، سەرنجی هەندێك لە فەیلەسووفەکانی ڕاکێشا • فەیلەسووفەکان کە بینی‌یان هۆمێروس و وێژەرەکانی تر خواکان وەکوو ئادەمیزاد لەقەڵەم دەدەن ، بە

---

(٣) ناوی هۆمیرۆس لە زمانی یۆنانی‌دا بە واتای ڕێکخەر هاتووە ، بۆیە هەندێك لە ڕەخنەسازە هاوسەردەمەکان دەڵێن : (ئەلیاذە) و (ئۆذیسە) بەرهەمی دوو پشتی‌جیاوازن (ئەلیاذە) بەرهەمی سەدەی نۆیەمی پێش زایینە بەڵام (ئۆذیسە) لە ئاخروئۆخری سەدەی نۆیەم و نیوەی سەدەی هەشتەمی پێش زایین‌دا ئەنجام دراوە . هۆمیرۆسیش بە ناوبانگ‌ترین یاخود تازەترینی ئەو هەستیارانەیە کە هەردوو هۆنراوەکەی کۆکردۆتەوە و یاخود گێڕاونەتیەوە و ڕێکیانی خستووە .

(٤) بڕوانە کتێبی (تاریخ الفلسفة الیونانیة) ل ٣ .

بۆ ئەوەی پەیڕەویی یاسای هۆشمەندی و لۆجیك [٥] بکەن ، دەستیان کرد بە پەلاماردانی هونەری هەڵبەست و هۆنراوەشیان بە کارێکی بێ کەڵك تەماشاکرد •

بەڵام کۆمەڵێك لە ڕەخنەسازان وەڵامی ئەو فەیلەسووفانەیان دایەوە و هۆنراوەیان وەکوو هونەرێکی مێتەفۆری لێکدایەوە و بەرگرییان لە وێژەرەکان کرد بە بەڵگەی ئەوەی خاوەن ئەندێشە و سۆزن و بەرهەمەکانیان دەبێ وەکوو هونەرێکی جوان تەماشا بکرێت •

بۆیە دەستیان کرد بە شیکردنەوەی هۆیەکانی جوانیی هۆنراوە : لە ئەنجامدا ئەم جوانییەیان لە مۆسیقای هۆنراوەدا بەدیهێنا و ئاوازەکانی کێشیان لێکدایەوە و بەسەر چەند چەشنێكدا دابەشیان کرد و پەیوەندیی هەر چەشنێکیان بە واتا و بابەتێکەوە دەستنیشانکرد • هەروەها ئەو جوانییەیان لە زماندا بەدیکرد و سەلماندیان کە زمانی هۆنراو لە زمانی ڕۆژانە بە ڕێکوپێکی و ووشەی مێتەفۆری و وێنەی هونەری جیادەبێتەوە •

سنووری ئەم باسانە کە دژواریی هەڵوێستی فەیلەسووفەکانە سەرەتایەکە بۆ زانستی مێتەفۆر و هۆیەکی سەرەکییە لە هۆیەکانی پەیدابوونی لێکۆڵینەوەی هونەری ڕەوانبێژی لە ڕەخنەسازیی یۆنانیدا •

## سۆفستاییەکان و زانستی مێتەفۆر

دووای زاڵبوونی یۆنانییەکان بەسەر فورسەکاندا و ڕزگاربوونی وولاتەکەیان دەرفەتی پێشکەوتن و پەرەسەندنیان هاتەکایەوە ، بۆیە لە سەرانسەری یۆناندا کۆمەڵێك زانا و هەستیار و هونەرمەند و مێژووشوناس و پزیشك و پیشەساز هەڵکەوتن و ، دیمۆکراتیەت باڵی بەسەر هەموو

---

(٥) لۆجیك : المنطق .

شارەکاندا کێشا و دەمەتەقێ و گفتوگۆ لە دادگا و یاریــگا و مەیــانەکانی شاری ئەثینــادا بە تونــدوتیژی دەربارەی زانیاری و دادگەری و وێــژە بەرپا بوو • لەبەر ئەوە فێربوونی دوواندەری (٦) وەك پێویستیــەکی میللی وابوو •

لەم نێوانەدا کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیران پەیدابوون و دەرفەتی باشیــان بۆ هەڵکەوت و بوون بە مامۆستای هونەری رەوانبێژی ، ئەم کۆمەڵەش بە نازناوی سۆفستائی (٧) ناسرابوون •

سۆفستاییەکان لە فەلسەفەدا کەسایەتیی ئادەمیزادیان دووپات کردەوە و سەلماندیان : ئازادیی بیرکردنەوە و کردەوە بنچینەیەکی دان پیانراوە و لــەم جیهانەدا ڕاستیی بێسنوور نیە و تاقە بەرژەوەندیش هێنانەدی ئارەزووەکانی خاوەن بەرژەوەندە •

(ئەرستوفانیس) (٨) هەرچەندە دوژمنی خوێنخۆری سۆفستاییەکان بوو دەرحەقیان دەڵێت : سۆفستاییەکان لاوانیان فێرکرد : چۆن پەیڕەوی دەستووری ووردبکەن و لە وێژەدا چۆن هۆنراو بهۆننەوە و چۆن شت لێك بدەنەوە و گومان بکەن و لــە هەموو بابەتێــك دوودڵ ببــن و هەمــوو بیروباوەڕێك یەکالاّبکەنەوە • هەروەکوو لە دەنگ و باسی سوفستاییەکان و مشتومڕی سوکرات و ئەفلاتۆن لەگەڵیاندا دەردەکەوێ (٩) ئەمتاقمە دەستێکی بالاّیان لە رەخنەسازیدا هەبوو ، بە تایبەتی (برۆتاگوراس) و (هبیاس) و

---

(٦) دوواندەری : الخطابة .

(٧) سۆفستایی : لە ووشەی (سۆفستۆس) واتە : مامۆستا وەرگیراوە ، هەندێك دەڵێن لە بنەڕەتدا بە واتای گەڕۆك هاتووە .

(٨) ئەرەستوفانیس : کۆمیدی نوسێکی بە ناوبانگی یۆنانییە لە ساڵی ٤٥٠ی پێش زایینداد لەدایكبووە لە پاش ساڵی ٤٠٨ پێش زاییندا کۆچی دوایی کردووە .

(٩) بڕوانە کتێبی فن الشعر لاپەڕە ٤٨ .

(برۆدیکۆس) که له زۆربەی بابەتەکانی دوواندەری و زمانەوانی و هونەری رەوانبێژییان کۆلیوەتەوە •

ئەوەی لەم لێکۆلینەوەیه پێوەندی به زانستی میتەفۆرەوە هەیێت دوو بابەتە :

بابەتی یەکەم : لێکدانەوەی داستان و هۆنراوەیە لەسەر بناغەی ڕەمز و میتەفوردا :

سۆفستاییەکان لەم بابەتەدا به بێ ئەوەی سەرنج لە واتای فەرهەنگیی ووشه بدەن و پەیڕەویی سروشتی زمان و یاسای هۆشمەندی و لۆجیك له گواستنەوەی دەربڕین له واتایەکەوه بۆ واتایەکی تر بدەن دەستیانکرد به لێکدانەوەی زمانی داستان و هۆنراوەکان به بێ سنوور و به هەوەستی خۆیان واتایان بەسەر ئەو زمانەدا سەپاند : تا ڕادەیەکی وا ئیتر هیچ واتایەکیان بۆ زمانی یۆنانی بەجێ نەهیشت و واتای نوێیان بۆ ووشەکانی ئەم زمانە سازکرد و داتاشی •

بابەتی دووەم : یاریکردن به ووشه :

دوێنەری سۆفستایی بەناوبانگ (جۆرجیاس) دەربارەی کارتێکردنی ووشه له مرۆڤدا دەڵێت : «ووشه هێزێکی بێ سنووره کاری بێ هاوتا ئەنجام دەدات • هەرچەندە به ڕواڵەت نرخێکی ئەوتۆی نیه بەلام له کردەوەدا جڵەوی ترس ڕادەگرێت و خەفەت دەڕەوێنی و خۆشی و بەختیاری دەبەخشێت و دەروون له پەرمۆده و دڵنیایی پڕدەکات و هۆشمەندی دەخاته داوی جادووگەرییەوه و هەندێ جاریش دڵ و دەرونی مرۆڤ داگیردەکات و لغاوی ویستەمەنی لێ دەسەنێتەوه و وای لێدەکات که کارێ وا بکات لەگەڵ ڕەوشت و نەریتی کۆمەڵەکەیدا نەگونجێت •

سەرەنجام شوێنەواری ووشه له سەر بڕواپێکردنی هۆشمەندیيانه

ڕاناوەستێ و لە سنووری تێدەپەڕێت بۆ کارتێکردن لە سۆز [١٠] ئەم بیروڕایەی (جۆرجیاس) دەربارەی سروشتی ووشە و پێوەندیی دەروونی گوێگر و خوێنەر بەم سروشتەوە چوارچێوەیەکی فەلسەفی‌یانەیە بۆ ڕێبازی سۆفستایی‌یەکان لە ڕابەریی جەماوەر و بەدیهێنانی ئامانجە رامیارییەکانیاندا •

ئەوەی ناسراوە لە مێژووی فەلسەفەی یۆنانی‌دا سۆفستائی‌یەکان کە بەرامبەر کۆمەڵێك دەدووان : بیروباوەڕەکانیان بە جوانترین ووشە و ڕازاوەترین ڕستە دەدەبڕی ، جگە لەوەی بە زمانێکی تەڕ و پاراو بڕوایان بە خەڵکی دەهێنا • پشتگیریی بابەتێکیان دەکرد و لە هەمان کاتیشا دژی ڕادەوەستان • لایان گرنگ نەبوو ڕاستی ئەو بابەتە دەربخەن بەڵکوو هەموو ئامانجیان سەرنج‌ڕاکێشان و گومان‌چاندن بوو •

بنچینەی ئەم ڕێبازەی سۆفستایی‌یەکان خولقاندنی دەربڕینی تازە و لە خشتەبردنی واتای واژە و یاری‌کردن بە ووشە بوو •

بۆ نموونە ، گیورگیاس : لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا ( نەبوون ) سێ بیرۆکەی سەرەکی دەسەلمێنی :

بیرۆکەی یەکەم : شت‌بوونی نی‌یە •

بیرۆکەی دووەم : ئەگەر شتێ هەبێ مرۆڤ ناتوانێ هەستی پێ بکا و لێی تێبگا •

بیرۆکەی سێ‌یەم : ئەگەر واداێین کە یەکێك هەیە تێی‌گەیشتووە ، ناتوانێ ئەو تێگەیشتنەی دەرببڕێت و بیگەیەنێتە خەڵکی •

کەوابوو زمان لە لای (گیورگیاس) و هەموو سۆفستایی‌یەکان هیچ

---

(١٠) بڕوانە کتێبی دراسات فی النقد الادبی ل ٧٣ .

سوودێکی نەماوە و وەکوو پێوەندییەکی کۆمەڵایەتی لە نێوانی قسەکەر و قسەبۆکراو لە کارکەوتــووە و ئەو زانستانــەی کە بــۆ لێکۆڵینــەوە و دەست نیشان کردنی واتای ووشە بەرپابوون هیچ پێویستی یەکیان پێ نەماوە، چونکە هەموو ووشەیەك دەشێ بۆ واتایەك و دژی ئەو واتــایەش بێت و مرۆڤیش بوێ هەیە کە دەربڕینێك لە یەك کاتا بە واتای فەرهەنگی و بــە ئاوەڵواتاکەی بەکاربهێنێت •

## فەرامۆش کردنی مینەفۆر لە نێوانی سۆکرات و ئەفلاتۆندا

سوکرات کە لەسەرەتای ژیانی‌دا سۆفستایی بوو هەستی بــە زیــانی فەلسەفەی سۆفستایی‌یەکان کرد و دەســتی کرد بــە بەرپەرچدانــەوەی بیروڕاکانیان بە گشتی و وەڵامدانەوەی هەڵوێستەکەیان دەربارەی زمــان و ئەرکی ووشە و دەربڕینی لە تێگەیاندنی جەماوەر بە تایبەتی • ڕاستە کــە قسەکانی سوکرات ڕاستە و خۆ تۆمار نەکراوون و هەروەکوو ووتراوون بە دەستمان نەگەیشتوون ، بەڵام ئەفلاتۆن کە شاگردێکی دڵسۆز و بە وەفای بووە لە کتێبەکانیــدا قســەکانی مــامۆستاکەی بەوپــەڕی ووردییــەوە چەسپاندووە •

ئەوەی لەم قسانە پێوەنــدیی بە هەستیــار و هۆنــراو و کێشــەی ئاوەڵواتای ووشە و دەربڕینەوە هەبێت لە بەشی دەیــەمی کۆمــارەکەی و دەمەتەقێی (ئەیون) و دەمەتەقێی (مێنوندا) بەردەست دەکەوێ •

بابزانین سوکرات لەبەر تیشکی سەرنجە گشتی‌یــەکانی دەربــارەی هەستیار و هۆنراو چۆن روانیویەتە ئاوەڵواتای ووشە کە بڕبڕەی دەربڕینی هونەری‌یە ؟ سەرنجە گشتی‌یەکانی سوکرات لەم ڕووەوە لەسەر بنــاغەی نەظریەی نموونەکان [11] دامەزراوە ، ئەم نەظەریــەیەش هەروەکــوو لــە

(11) نموونەکان : المثل .

فەلسەفەی یۆنانیدا ئاشکرایە ، سێ جیهان بۆ زانیاری دەستنیشان دەکات:

یەکەم : جیهانی ئایدیالیستی [12] کە بارەگای نموونەی هەموو راستیەکانە •

دووەم : جیهانی هەستپێکراو : کە شانۆی ئەو شتانەیە کە ئادەمیزاد بە یەکێك یان زیاتر لە پێنج هەستپێکەرەکانی هەست پێ دەکات و لێی تێدەگات •

سێیەم : جیهانی سێبەر کە هونەرمەندەکان بە هۆی هونەرە جوانەکانە وە سازی دەکەن •

سوکرات لە سەر هێڵە گشتییەکانی ئەم نەظەرییەیە دەمەتەقێیەك لەگەڵ (جلۆکۆن) [13] دەکات و دەڵێت : « لە دووای بیرکردنەوە و ووردبوونەوە لە نێوان ئەو هەموو چاکانەی لە رژێمی کۆمارەکەماندا دەردەکەوێ ، هیچ شتێك لە یاسای تایبەتیی هۆنراو زیاتر خۆشحاڵم ناکات•

جلۆکۆن : ئەوە چیە پەنجەی بۆ درێژ دەکەی ؟

سوکرات : فڕێدانی هۆنراوەی لاساییکەرەوە و گوێرانەگرتنە بۆ هەستیاران » [14] •

لەم دەقەدا دوو بڕیاری سوکراتی دەربارەی هۆنراو بەرچاو دەکەون :

بڕیاری یەکەم : فڕێدانی هۆنراوەیە و گوێنەگرتن لە خاوەنەکەیەتی کە هەستیارە •

---

(١٢) ئایدیالیستی : مثالي •

(١٣) جلۆکۆن : ناوی کابرایەکە کە ئیفلاتۆن لە کۆمارەکەیدا کردوویەتی بە هاودەمی سوکرات •

(١٤) بڕوانە (النقد) اسس النقد الادبی الحدیث ل ١٨ •

بڕیـاری دووەم : تەماشـاکردنی هـۆنراو وەکـوو بەرهەمێـکی لاسایی‌کەرەوە •

بێ گومان بڕیاری یەکەم ئەنجامی دووەمە و ئەوانەی بڕوایان پـێ هەیە پشت بەوە دەبەستن کە هۆنراو تەنها لاسایی‌کردنەوەی سروشـت و کردەوەیە • بۆیە بابزانین سوکڕات دەربارەی سروشتی لاسایی‌کردنەوە بـە گشتی چۆن دەدوێ ؟ •

سوکڕات لە دەمەتەقەکانیدا هەمیشە لە بابەتێکی گشتی دەدووێ ، ئەمجا بیروڕاکانی دەربارەی بابەتە تایبەتیەکە پێش‌کەش دەکات ، بۆیـە لـە سەرەتای بابەتی لاسایی‌کردنەوە باسی هونەری نیگارکێشـان دەکـات و دەڵێت :

«کەوابوو ئەی جلۆکۆن لیرەدا سێ جۆر چەرپـایە هەیـە و سـێ هونەرمەند سەرپەرشتی دروست‌کردنیان دەکـەن • خـوا و دارتـاش و نیگارکێش •

جلۆکۆن : بەڵێ لێرەدا سیانن •

سوکڕات : کەواتە خوا ئەگەر بۆ ئارەزوو یان بۆ پێویستیی خـۆی تەنها یەك چەرپایەی لە سروشتدا خوڵقاندووە و زیـاتر نیە جـا ••• خـوا ئەمەی زانیوە و ئارەزووی وابووە ، بۆ چەرپایەکی ڕاستی خۆی ببـێ بـە دروست‌کەرێکی ڕاستەقینە و نەبێ بە دروستکەرێکی ناسراو بۆ چەرپایەکی دیاری‌کراو • لەبەر ئەوە یەك چەرپایەی خوڵقاندووە و چۆنێتی‌یەکەی وا پێویست بوو کە تاقانە بێت •

جلۆکۆن : ئەی دەربارەی دارتـاش چی‌دەڵێن ؟ ئایـە ئەو دووبـارە دروست‌کەری چەرپایە نیە ؟

سوکرات : بەڵێ •

جلۆکۆن : ڕات چیە دەربارەی نیگارکێش ؟ ئایا پێی دەڵێین دروستکەر ؟

سوکرات : بێ گومان نەء •

جلۆکۆن : ئەگەر دروستکەر نەبێ چ پەیوەندی‌یەکی بە چەرپایەوە هەیە ؟

سوکرات : لەو باوەڕەدام ئەتوانین ناوی بەلاسایی‌کەرەوەی ئەو شتانەی خەڵکی تر دروستی دەکەن بەرین •

جلۆکۆن : زۆر باشە ، ئایا سێیەمیش بە پێی زنجیرە سروشتی‌یەکەی بە لاسایی‌کەرەوە ناوی دەبەی ؟

سوکرات : بێ گومان ، هەروەها هەستیاری تراجیدیاش وەکوو لاسایی‌کەرەوەکانی تر لاسایی‌کەرەوەیە و سێ پلە لە ڕاستی و خواوە دوورە »[١٥] •

ئەم بڕیارەی سوکرات پرسیارێکی سەرەکی دەربارەی نرخی هونەری لاسایی‌کەرەوە بەرپا دەکات ، خۆشی ئاگای لەمە هەیە ، بۆیە ڕودەکاتە جلۆکۆن و دەپرسێت : «مەبەست لە هونەری نیگارکێشان لاسایی‌کردنەوەی شتەکانە هەروەکوو خۆیان ، یان بە پێی دەرکەوتن یاخود بەگوێرەی ڕواڵەت یان ڕاستی ؟ •

جلۆکۆن : ڕواڵەت •

سوکرات : کەواتە جیاوازییەکی فراوان لە نێوان لاسایی‌کەرەوە و

---

(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢ .

راستی‌دا هه‌یه و له توانایا هه‌موو شتێك ــ ته‌نها ــ به ده‌ستلێدانی پارچه‌یه‌کی بچووك ئه‌نجامبدات ئه‌و پارچه‌یه‌ش ڕواڵه‌تی‌یه و به‌س ، ئه‌مه‌ش به‌ڵگه‌یه‌که له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی که نیگارکێش وێنه‌ی دارتاشێك یان پینه‌دۆزێك یان هه‌ر وه‌ستایه‌کی تر ده‌کێشێ ، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شا هیچ له پیشه‌کانیان نازانێ ، ئه‌گه‌ر هونه‌رمه‌ندێکی لێهاتوو بێت له توانایا هه‌یه منداڵ و ئه‌و که‌سانه‌ی ساکارن هه‌ڵبخه‌ڵه‌تێنێ ، کاتێ له ده‌ره‌وه وێنه‌ی دارتاشه‌که‌یان پێشان ده‌دات ، وا هه‌ست ده‌که‌ن سه‌یری دارتاشێکی ڕاسته‌قینه ده‌که‌ن .

جلۆکۆن : به هه‌موو دڵنیایی‌یه‌که‌وه : وایه (١٦) .

که‌وابوو نیگارکێش له ڕوانگه‌ی (سوکرات)ه‌وه درۆزنه و هونه‌ره‌که‌ی درۆیه و له به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ستیاری به هه‌مان چاو ته‌ماشا کردووه و هۆنراوه‌که‌ی به هه‌مان پێوانه پێواوه ، ده‌رهه‌ق به نووسه‌رانی تراجیدیا که باشترین هه‌ستیارانی سه‌رده‌مه‌که‌ی بوون ده‌ڵێت : «له‌به‌ر ئه‌وه ئه‌گه‌ر گوێمان لێ بوو خه‌ڵکی ووتیان نووسه‌رانی تراجیدیا وه له سه‌رووی هه‌موویانه‌وه (هۆمیرۆس) له چاکه و خراپه و هه‌موو بابه‌تی ئاده‌میزاد و هونه‌ر و کاروباری ئاسمانا شاره‌زان ، چونکه هه‌ستیاری باش ناتوانێ هۆنراو دروستبکات هه‌تاکوو ــ زانیاری‌یه‌کی ته‌واوی له باره‌ی بابه‌ته‌که‌ی خۆیه‌وه نه‌بێ و ئه‌وه‌ی ئه‌م زانیاریانه‌ی نه‌بێ هه‌رگیز نابێ به هه‌ستیار ، ئه‌گه‌ر گوێمان له‌وه بوو پێویسته بڵێین : که هه‌مان ده‌ستخه‌ڕۆیی پێشوو له‌م قسه‌یه‌دا هه‌یه ، له‌وانه‌یه ئه‌مانه تووشی هه‌ندێ لاسایی‌که‌ره‌وه بووبن و به ڕاده‌یه‌کی ئه‌وتۆ ده‌ستخه‌ڕۆکرابن هه‌ستیان به‌وه نه‌کردووه که به‌رهه‌مه‌کانی ئه‌م لاسایی‌که‌ره‌وانه سێ پله له ڕاستی‌یه‌وه دوورن »(١٧) سوکرات له‌سه‌ر ئه‌م ڕێچکه‌یه زیاتر هه‌نگاو هه‌ڵده‌گرێ و چه‌ند پرسیارێکی سه‌رسوڕمانی

---

(١٦) هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل ٢٤ .
(١٧) هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل ٢٥ .

دەرهەق بە (هۆمیرۆس) دەچەسپێنی و دەڵێ : «ئایا وەکوو (کاسکلیۆس) نەخۆشەکانی چاك کردۆتەوە ، یان قوتابخانەیەکی پزیشــکیی لــە دووای خۆیەوە بەجێ هێشتووە ؟ ! •••ئێمە لەسەر ڕاستی دەبێن ئەگەر پرسیارمان دەربارەی تەکنیکی جەنگی و ڕامیاری و فێرکردن لە (هۆمیرۆس)کرد ، کە لە هۆنراوەکانیدا گرنگترین و بەرزترین بابەتن ، بۆیە ئەیدوێنـین و پێی دەڵێن : ئەی (هۆمیرۆس)ی هاوڕێمان ئەگەر تۆ وا بووی ئەوەی دەیڵێـی دەربارەی گەورەیی دوو پلە لە ڕاستییەوە دووره نەوەك سێ پلە واتە تـۆ دروستکەری سێبەر و لاسایی‌کەرەوە نیت و ، ئەگەر لــە تواناتـا هەیـە جیاوازیی ئەو ڕێگایانەی سوود یاخود زیان بە ئادەمیزاد لە ژیانی تایبەتی یان گشتییدا ئەگەیەنێ دەرخەیت و پێمان بڵێ کام دەوڵەت سوودی لە یارمەتیت وەرگرتووە [١٨] ئەم پرسیارانەی سوکرات بڕیـارین و چـاوەڕیی هیـچ وەلامێك ناکەن و دەیانەوێ راستییـەك دەربـارەی سـوودی هـۆنراو بسەلمێنن و بڵێن هۆنراو هیچ سوودێکی نیە و ناشی بێت ، ئەم راستییەش سەرئەنجامێکی سروشتییە لەو نرخ‌پێدانـەی هونـەرەوە بـە گشـتی هەڵدەقوڵێ ، چونکە ئەگەر هونەر سێ هەنگاو لە ڕاستییەوە دووربێت و خولقێنەرەکەی درۆزن بێت هەڵبەتە هیچ کەڵکی بۆ ژیانی ئادەمیزاد نابێت و میللەت هەرگیزاو هەرگیز سوودی لێ نابینێت •

سوکرات بەمەوە ناوەستێ بەڵکوو ڕوو دەکاتە (جلۆکۆن)ی هاودەمی و دەڵێت • «کەچی ئێمە هێشتا خاڵە گرنگەکەمان لە تاوانبارییەکە نەخستۆتە بەرچاو ، ئەویش ئەوەیە هۆنراو توانای ئەوەی هەیە زیـان بە ئادەمیـزادە باشەکانیش بگەیەنێ [١٩]» سوکرات پاش ئەوەی ناوەڕۆك و بابەتی هۆنراو بەو جۆرە لە قەڵەم دەدات دێتە سەر باسی هۆی دەربڕین و دەڵێت :

---

(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦ •
(١٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٧ •

«ئەم هەستیارانە بگرە لە (هۆمیرۆس)ەوە لە لاسایی‌کەرەوە یەك زیاتر هیچی تر نین ، لاسایی وێنەی چاکەیان کردۆتەوە و هەرگیز ناگەن بە ڕاستی. هەستیار وەکوو نیگارکێش و لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێـك لەپیشـەکەی نازانێ ، ئەوانەی لەو زیاتری لێ‌نازانن سەریان سوڕدەمێنێ کاتێ نیگارەکەی دەبینن و تەنیا لە دوو توێی دەنگ و ڕوخسارەکەیا حوکمی بەسەرا دەدەن .

جلۆکۆن : تەواوە بەڵێ وایە .

سوکرات : بە هەمان ڕێگا هەستیار بە هۆی ووشە دەربڕینـەکانیەوە هونەری جۆربەجۆرمان پێشکەش دەکات لەو پێشکەش‌کردنەدا تەنها بـە ڕادەی لاسایی کردنەوەکەی لە سروشتی ئەو هونەرە دەدوێ و ، کەسانی تری هاوتەرازووی ئەو لە نەزانینا تەنیا لە ڕوانگەی ووشەکانیەوە حوکمی بە سەرا دەدەن و وا بە بیریانا دێت داهێنانی تێدا دەکەن بەڵام داهێنانەکەیان لە بارەی دروست‌کردنی پێڵاو یان تەکنیکی جەنگی ، یان هەر بابەتێکی ترەوە بێت تەنها بە پاڵپشتی کێش و ترپە و ئاواز ئەنجام دەدرێت . دەبێ زۆر جار بی‌نیبێتت ، حاڵی شانۆگەری ئەو هەستیارانە چیی بەسەر دێت کە لە قاڵبێکی دوور لە مۆسیقا و لە چوارچێوەی پەخشانێکی ساکاردا گیرڕابێتەوە .

جلۆکۆن : بەڵێ .

سوکرات : لە دەم و چاوێك دەکات بە منداڵی وەکوو گوڵ بووبێ و ئێستا لاوێتی بەسەر چووبێ [٢٠] » .

سوکرات لەم دەقەدا ڕاستەوخۆ فەرامۆشی ئەرکی ووشە و میتەفۆر و دەربڕینی هونەری ئاوەڵواتایی لە خولقـاندنی هـۆنراوەدا دەکات و ئـەم خولقاندنەش دەگەڕێنێتەوە بۆ کێش و ترپە و ئاواز بە تەنیا ، جگە لەوەش

---

(٢٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٩ .

ئەو هۆیانەی بنیات نانی فۆرم و روخساری هۆنراوە بە چاوێکی تاوانباری‌یەوە تەماشا دەکات و بە رێگای هەڵخەڵەتاندنی خوێنەری هۆنراو و دەستخەرۆکردنی بینەرانی شانۆگەری دەزانێ ، بۆیە بە هیچ جۆرێك باسی ووشە بە گشتی و ئاوەڵواتای ووشە بە تایبەتی ناکات ، زیاتر لەمەش سەرچاوەی هۆنراوی سوودبەخش و هۆنەری هۆنراوخوانی بە خورپە و ئیلهام دەزانێ ، بۆیە دەڵێ : (خوای هونەر خورپە و ئیلهام بە هەندێ کەس دەبەخشێ و ، لەم کۆمەڵەی کە خورپە و ئیلهامیان پێ بەخشراوە زنجیرەیەك پێك‌دێت ئەم خورپە و ئیلهامە کاریان تێ‌دەکات ، هەموو هەستیارە لێ‌هاتووەکان ئەگەر چی لە خاوەن داستانەکان بن یان هۆنراوەی گۆرانی ، هۆنراوە جوانەکانیان بە هۆی هۆنەرێك کە بە فیربوون چنگیان کەوتبێ ناهۆننەوە ، بەڵکوو هۆی ئەوەیە خورپە و ئیلهامیان پێ بەخشراوە ، هەروەکوو چۆن (کۆربنیتیە) (گیرەشێوێنەکان) بەبێ هۆشی سەمادەکەن ، هەروەها هەستیارەکانیش ئاوازە خۆشەکانیان دەهۆننەوە و بێ ئەوەی هەستی پێ‌بکەن ، خۆرپە و ئیلهام وەردەگرن و وەکوو حاڵ لێهاتوویان لێ دێت [21]» .

سوکرات بەم بیرورایە دەربارەی هۆنراو و باری هەستیار و پێوەندیی بە خەڵکی‌یەوە دەرگا لە رووی هەموو زانستەکانی فێربوونی هۆنراو و لێکۆڵینەوەی وێژە دادەخات و دوپاتی دەکاتەوە کە لەبەر ئەوەی هەستیار بە خورپە و ئیلهام هۆنراوەکانی چنگ دەکەوێت هیچ پێویستیەکی بە زانستی زمان و هونەری رەوانبێژی و کێش و سەروا نیە ، هەروەها خوێنەران لەبەر ئەوەی حاڵی هەستیارەکان دەیانگرێ و بەم هۆیەوە چێژوچەشە لە هۆنراوەکانیان وەردەگرن هیچ سوودێك لە زانستی

(٢١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٣ .

ڕەخنەسازی وەرناگرن و بە بێ ڕەخنەساز لە هەموو بەرهەمێکی وێژەیـی تێ دەگەن •

## لەرستۆ و لیکۆڵینەوەی مینەفۆر

ئەوەی ئاشکرایە لە مێژووی زانستەکانی وێژەدا : ئەرستۆ یەکەمـین زانایە کە دەستێکی باڵای ئەوتۆی لەم کۆڕەدا هەبوو بـە دامەزرێنـەری بنچینەی لێکۆڵینەوەی هەموو زانستەکان دەژمێررێ •

مێژووشوناسی زانستەکانی زمان ئەگەر بیەوێ لەبـەر تیشـکی ئەو راستی‌یـەدا نـرخی لێکۆڵینـەوەی ئەرستـۆ لـە زانستی ئاوەڵواتـادا هەڵبسەنگێنێ ، دەبێ دوو ڕاستی ڕەچاو بکات و هەمیشە بیانهێنیتەوە یاد:

ڕاستی‌یەکەم : ئەوەیە کە سۆفستایی‌یەکان جڵەوی بەکارهێنانی ووشە بە گوێرەی واتا فەرهەنگی‌یەکانیان و ئاوەڵواتاکانیان بەرەڵاکرد و بە بـێ سنوور مافیان بە دوێنەران و وێژەران دا کە بە ئارەزووی خۆیان ووشـە بەکاربهێنن و دەربڕین سازبکەن و ڕەخنەسازان بە بێ دەستوور ڕاڤەی دەقە وێژەیی‌یەکان بکەن و تأویلی نابەجێ بە زۆرەملێ بەسەر ووشە و ڕستەکاندا بسەپێنن •

ڕاستی دووەم : ئەوەیە سوکرات و ئەفلاتۆن هەرچەندە بەو ئیشـە ناڕەوایەی سۆفستایی‌یەکان قایل نەبوون و هەڵوێستێـکی بە پێچەوانـەی ئەوانیان هەبوو ، بەڵام لە بـاسی مینەفـۆردا هیـچ لێکۆڵینەوەیەکیـان بەجێنەهێشت و نەیانتوانی لـە میـانی واتـای ووشـەدا ڕێـگا بـەو گێرەشێوێنی‌یەی سوفستایی‌یەکان بگرن :

ئەم دوو ڕاستی‌یە ، بە لای ئێمەوە ــ هۆیەکی سەرەکین لەو هۆیانەی کە پاڵیان بە ئەرەستۆوە نابێت بۆ یەکەم جار لە مێژووی زانستەکانی زماندا

لێکۆڵینەوەیەکی پێگەیشتوو دەربارەی میتەفۆر و ئاوەڵواتـا پێـش کەش بـکات •

ئەرستۆ کە بینی هەندێك لە وێژەران بە کارتێکردنی سۆفستایی‌یەکان بە ئارەزووی خۆیان ووشە بۆ واتا ناسراوەکانیان بە کارناهێنن و دەربڕیـن بە بێ دەستوور بۆ واتای نوێ دادەتاشن و ئەگەر هاتوو لەم کارە ناڕەوایە ڕەخنەیان لێ گیرا دەڵێن :

ئێمە لەم ئیشە هونەرییەماندا میتەفۆر سازدەکەین ، دەستی‌کرد بە سنوور کێشانی میتەفۆر •

ئەرستۆ بۆ ئەوەی ئەم سنوورکێشانەی زانستی‌یانە بێت پێناسەیـەکی وورد و دەست‌نیشانکراوی میتەفۆری دانا و ووتی :

«میتەفۆر گواستنەوەی ووشەیەکە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر[٢٢]»

ئەرستۆ لەم پێنـاسەیەدا هەستی بـەوە کرد ئەگەر بێتو بناغەی پتەو بـۆ ئەم گواستنەوەیە دانەمەزرێنێ هێشتا دەروازەی یـاری‌کردن بـە واتـای ووشەکان بە بەرەڵڵایی دەمێنێتەوە ، سەرئەنجـام دووا بـە دووای ئـەم پێناسەیە ووتی : «گواستنەوەش یان لە ڕەگەزەوە [٢٣] بۆجۆر [٢٤] یان لە جۆرەوە بۆ ڕەگەز یان لە جۆرەوە بۆ جۆر یان بـە پێی لێکچوانـدن [٢٥] دەبێ [٢٦] » •

کەواتە وێژەر و لێکدەرەوەی دەقی وێژەیی و ڕەخنەساز تەنها لەسەر یەکێك یان پتر لەو چوار بناغەیەدا بۆیان هەیە ووشەیەك لە واتایەکەوە بـۆ

---

(٢٢) کتێبی فن الشعر ل ٥٨ •
(٢٣) رەگەز : الجنس •
(٢٤) جۆر : النوع •
(٢٥) لێکچواندن : التمثیل والمشابهة •
(٢٦) کتێبی فن الشعر ل ٥٨ •

واتایەکی‌تر بگۆیزنەوە • ئەرستۆ بە نیازی پتەوکردنی ئەو بناغانە یەکە یەکە دەستی کرد بە ڕوونکردنەوەیان و ووتی «مەبەستم لەم قسەیە لە ڕەگەزەوە بۆ جۆر ، بە بەڵگەی : «کەشتی‌یەکە لێرەدا وەستا » ؛ چونکە لەنگەرگرتن جۆرێکە لە وەستان ئەمەش نموونـەی جـۆرە بـۆ ڕەگـەز : (بـەڵێ ئۆرسیۆس ) [٢٧] هـەزاران کاری بـە نرخی کردووە ) لەبـەر ئـەوەی ( هەزارەها) مانای زۆر ئەگرێتەوە ، بۆیە هەستیار لەبری ووشـەی زۆر بەکاری‌هێناوە• نموونەی میتەفۆر لە جۆرەوە بۆ جۆر ئەمەیە : (بە شیری مس گیانی لێ‌سەند) (ژیانی بە جامێکی مسی تیژ پچڕا) چونکە سەندن لێـرەدا بە واتای پچڕاندن دێت پچڕاندنیش واتاکەی جۆرێکە لە سەندن لێرەدا بـە واتای کۆتایی‌هاتنی ژیانە ــ مردنە •

مەبەستم لەم قسەیەم : بەپێی (لێکچوون) هەموو ئەو حاڵەتانەیە کـە ئەبێ ڕێژەی ڕادەی دووەم بۆ ڕادەی یەکەم وەك ڕێژەی چوارەمە بۆ سێ‌یەم، چونکە هەستیار وای بە کاردەهێنێ کە چوارەم لەبری دووەمە و دووەمیش لەبری چوارەمە و لە هەندێ کاتدا ئەو ڕادەیەی کە پێوەندیی بـە ووشـە گواستراوەکەوە هەیە دەخرێتە سەر میتەفـۆرەکە بـۆ ڕوونکردنـەوەی مەبەستەکەم بە نموونە دەڵێم : کە ڕادەی نێوان (پێك) و (دیونیس) [٢٨] هەمان ڕادەی نێوان (قەڵغان)و (ئەرس)ە[٢٩] ، بۆیە هەسـتیار لە بارەی پێکەوە دەڵێت ئەمە (قەڵغانی دیونیسە) و لە بـارەی قەڵغانـەوە دەڵـێ (پێکی ئەرس)ە ، هەروەها ڕادەی نێوان پیرێتی و ژیان هەمان ڕادەی نێوان شەوورۆژە ، بۆیە هەستیار لە بارەی شەوەوە هەمان قسەی (ئەنبارۆتلیس) دەکات و دەڵێ : پیریەتی ڕۆژە و لە بارەی پیریەتی‌وە دەڵێ : (تاریکایـی

---

(٢٧) لە ئۆذیساوە وەرگیراوە ، سرودی یەکەم ل ١٨٥ .

(٢٨) دیۆنیس : خوای‌مەی .

(٢٩) ئەرس : خوای جەنگ .

ژیانە) یان ، (ئاوابوونی ژیان)ە و لە هەندێ باری لێکچواندندا ناوی تیادا نیە ، بەڵام لە بارەی ڕێژەوە دەڵێ : بۆ نموونە بەبڵاوکردنەوەی تۆو ئەووترێ (وەشاندن) بەڵام بۆ دەربڕینی کاری خۆر ئەویش کە بڵاوکردنەوەی تیشکەکانیەتی هیچ ووتەیەك نیە ، لەگەڵ ئەوەشدا ڕادەی ئەم کارە بۆ تیشکی خۆر هەمان ڕادەی (وەشاندن)ە ، بۆ تۆو ، بۆیە دەووترێ (ڕووناکیخوایی بڵاو دەکاتەوە ) • هەروەها دەتوانرێ هەمان شێوە لە میتەفۆر بە شێوەیەکی کە بە کاربهێنرێ ، پاش واتاگەیاندنی شتێك بە ناوێك بۆ شتێکیتر دانرابێ تایبەتییەکی ئەم ناوە دواییە پشتگوێ دەخەین : بۆ نموونە لەبری ئەوەی دەربارەی (قەڵغان) بڵێین پێکی (ئەرس)ە ئەڵێین «پێکێکی بێمەی»ە [٣٠] ئەم ڕوونکردنەوەیەی ئەرستۆ ، بناغەکانی میتەفۆر بە جۆرێکی قایم و پتەو دەچەسپێنێ ، جگە لەوەی دەرگای بەرەڵلایی بە کارهێنانی ووشە دادەخات و بۆ یەکەم جار ڕێبازێکی دەستووری بۆ شیکردنەوەی میتەفۆر پێشکەش دەکات •

ڕەنگە هەندێ لە ڕەخنەسازان توانج لەم ڕێبازە بگرن و سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشن کە ڕێبازێکی لۆجیکی ڕووتە و ئەگەر هاتو وێژەر پەیڕەوی کرد بەهرەی خولقاندنی وێنەی هونەری لە دەربڕینەکانیدا بە دەستی خۆی دادەمرکێنی • بەڵام ئەم جۆرە ڕەخنەسازانە دەبێ بزانن کە ئەم ڕێبازە ڕەنگدانەوەیەکی دژواریە لەو دەرفەتەوە هەڵقوڵاوە کە زمانی وێژەیی بە هۆی سۆفستاییەکانەوە ئاڵۆزاو بوبوو سەرەڕای ئەمەش لە هەموو کاتێکدا سنوورێکی زانستییانە دەربڕینی وێژەیی لە گێرەشێوێنی دەپارێزێ و ڕێگای بەدیهێنانی ئەرکی سەرشانی وێژەر کە پێوەندیکردنە بە جەماوەری خوێنەرانەوە خۆشدەکات •

---

(٣٠) بڕوانە کتێبی فن الشعر ل ٥٩ •

# ووشه و واتا له لای هۆراس‌دا

یه‌كه‌م ڕه‌خنه‌سازی ڕۆمانی له‌پاش نه‌مانی ده‌وڵه‌تی یۆنانیه‌كان كه باسی ووشه‌ی كردبێ و ده‌می ژه‌نیبێته میته‌فۆر (هۆراس)ه• ڕووداوه‌كانی ژیانی (هۆراس) هه‌رچه‌نده له ڕووی ڕاستی و ناڕاستی‌یه‌وه جێگای مشت‌ومڕی زاناكانی هاوچه‌رخمانه ، به‌ڵام ئه‌وه‌ی چه‌سپاوه : ئه‌م ڕه‌خنه‌سازه له شاری «ڤینۆسیا» ساڵی (٦٥) پێش‌زایین له‌دایك‌بووه و گومان ده‌كرێ كه بێگانه‌بووه و ڕۆمانی نه‌بووه ، چونكه باوكی له سه‌ره‌تای ژیانی‌دا به‌نده‌بووه ، بۆیه شاره‌زاكان له‌و بیروڕایه‌دان كه ئه‌غریقی‌یه و له ساڵی (٨) پێش‌زایین‌دا كۆچی دوایی كردووه [1] •

هۆراس گه‌لێ هۆنراوه و ووتاری جۆربه‌جۆری بۆ به‌جێ‌هیشتوین ، ئه‌وه‌ی پێوه‌ندی به باسه‌كه‌مانه‌وه هه‌یه له‌م به‌رهه‌مانه لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی ڕه‌خنه‌سازی‌یه • وا باوه ئه‌م لێكۆڵینه‌وه‌یه‌ی هۆراس مه‌به‌سته سه‌ره‌كی‌یه‌كه‌ی شیی‌كردنه‌وه و لێكدانه‌وه‌ی ڕه‌گه‌زه‌كانی هۆنراو نیه ، چونكه به په‌خشان نه‌نووسراوه‌ته‌وه و له قه‌واره‌ی هه‌ڵبه‌ستێك‌دایه و به‌كێش و سه‌روا و له شێوه‌ی نامه‌یه‌كدا ڕێكخراوه •

ئه‌وه‌ی ڕاسته (هۆراس) خۆی لێكۆڵینه‌كه‌ی ناونابوو Epistola. ad. Pisones واته ( نامه‌یه‌ك بۆ خێزانی بیزۆ) كه له سه‌رده‌می ژیانی (هۆراس)دا خێزانێكی ده‌سته‌ڵاتدار بوون• هه‌روه‌كوو له ناوه‌رۆكی ئه‌م نامه‌یه‌دا ده‌رده‌كه‌وێ نووسه‌ره‌كه‌ی ویستوویه‌تی له عاستی نرخ‌پێدانی هۆنراوه و چۆنیه‌تی ڕێكخستنی ئامۆژگاریی لاوه‌كانی ئه‌م خێزانه بكات •

له‌م ڕۆژانه‌دا ئه‌م هه‌ڵبه‌سته‌ی (هۆراس) به دوو ناونیشان ناوبانگی

---

(١) بڕوانه كتێبی فن الشعر هۆراس ل ٢٢ •

دەرکردووە : ناونیشانی یەکەم   Ars Poetica   واتە : هونەری هۆنراوە •
ناونیشانی دووەم :   Dearte Poetica   واتە : دەربارەی هونـــەری هۆنراوە •

جا لەبەر ئەوەی ئەم دوو ناونیشانە هیچ پێوەندیەکیان بە هۆراسەوە نیە و نەبووە و لەسەر دەمی ژیانیدا باویان نەبووە ، بابزانین لــە چیـــەوە هاتوون و بۆچی ناونیشانە ڕەسەنەکەی خۆی (نامەیەك بــۆ خێزانی بیـــزۆ) پشتگوێ‌خراوە ؟ وەلأمدانەوەی ئەم پرسیارە و هەموو پرسیارێکی تر لەم سووچەوە بە هیچ کلۆجێك ئاسان و زانستیانە نیە ؟ بەلأم تاقە هۆی ، کــە ڕەنگە لە ڕاستی‌یەوە زۆر دوور نەبێت و بتــوانێ ئــەم دوو ناونیشـــانەی لیکۆلینەوەکەی (هۆراس) ڕوونبکاتەوە بابەتی هەلبەستەکەیــە ، بۆیــە زۆربەی زاناکان لەو بڕوایەدان کە ئەو دوو ناونیشانە دەشێ لەوەوە هاتبن کە بابەتی هەلبەستەکە دەربارەی سروشت و چەشنەکانی هۆنراوەیە :

گرنگترین بیرۆکە لەم هەلبەستەدا کە تا ئەندازەیەکی فراوان زادەی بلیمەتیی (هۆراس) بێت و لە داهێنانیدا شوێن پێی ڕەخنەسازە یۆنانیەکانی هەلنەگرتبێت ــ باسی ووشە و واتایە •

هۆراس لەم باسەدا دەلێت : «ئەی ئەوانەی دەنووسنەوە ، بابەتێــك هەلبژێرن لەگەل ووزەتاندا بگونجێ ، لەوە دوور کەونەوە کە ناتوانن قورسیی بارەکەی هەلبگرن یاخود شانتان بۆ بارکردنی دەستنادات ، ئەگەر مرۆڤێك لە هەلبژاردنی بابەتەکەی‌دا سەرکەوتوو بوو ، هەرگیز پەنهانی دەربڕیـــن مافی لێ‌ناگرێت و داڕشتنی ڕەوان ملکەچی لێ‌ناکات »[٢] • لــەم چەنــد دێڕانەدا هۆراس گرنگیی بە بابەت و واتا دەدات و دەربڕین و ووشە بــە پلەی دووەم دەژمێرێ • ئەگەر لەبەر تیشکی مێژووی زانستی میتەفۆرا ئەم

---

(٢)  بڕوانە کتێبی فن الشعر هوراس ل ١١٠-١١٢ •

سەرنجە هەڵبەسەنگێنرێ بە هەنگاوێکی پێشکەوتن‌خوازانە لە قەڵەم دەدرێ ، چونکە هەروەکوو ئاشکرایە رەخنەسازە یۆنانیەکان بە گشتی و (ئەرستۆ) بە تایبەتی میتەفۆریان کە بڕبڕەی لێکۆڵینەوەی وشەیە دوور لە بابەت و واتاوە باس‌کردووە و بە ڕواڵەت تێیان ڕووانیوە و تەنها لە چوارچێوەی مانای زمانەوانی و واتای میتەفۆری هەڵیان‌سەنگاندووە و چەند دەستوورێکی تەنگەبەر و ووشك بۆگواستنەوەی ووشە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تریان سەپاندووە .

بەڵام (هۆراس) وای لێ‌نەکردووە و بە پێچەوانەی ڕەخنەسازە یۆنانیەکانەوە بابەت و واتای بە سەرچاوەی ووشە و دەربڕین داناوە و سەلماندوێتی کە وێژەر ئەگەر هات و لەگەڵ بابەتەکەی‌دا ئاشنایيەکی قووڵی هەبوو واتاکانی لە دڵو دەروونی‌دا پێ‌گەیشتبوون ئەوا بە ئاسانی دەربڕینی بەرز و ووشەی هونەری ساز دەکات .

کەوابوو دەربڕین و ووشە لە لای (هۆراس) بەرهەمی بابەت و واتان ، بۆیە ئەم ڕەخنەسازە ڕوو دەکاتە خوێنەر و گوێ‌گرەکانی و دەڵێت : «هەروەها ئەگەر هات و لەوانە بووین کە لە گونجاندنی نێوانی واتا و ووشەکانیان‌دا هونەرمەندن ، دەرفەتی ئەوەت دەبێت بە سازدانی ئەو دەربڕینانە کە ووشەی کۆن لە ناویاندا دەبنە ووشەی نوێ بگەیتە هونەری ڕەوانبێژی »[٣] بێ‌گومان گونجاندنی ووشەکان و ڕێکخستنیان ڕووداوێکی بابەتی‌یە و لە ڕازاندنەوەی ڕستە و یاری‌کردن بە دەربڕینەوە دوورە ، بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستی‌یە ئەوەیە (هۆراس) دەرگای سازکردنی ووشەی نوێ و بۆ گەیاندنی واتای تازە دەخاتە سەرگازی پشت و دەڵێت : «ئەگەر هات و واتای شارراوەی وا هەبوو بۆ ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنی پێویستی بە ووشەی نوێ‌باو هەبوو بۆ مرۆڤ هەیە واژەی وا سازبکات

---

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٢ـ١١٤ .

که بەرگوێی (سێتیجۆس) [٤] نەکەوتبێ ، ئەگەر هات و بە دەستکارییەکی کەمەوە لەسەر چاوەیەکی ئەغریقییەوە هەڵقولابوو • ئایا مافێك هەیە ڕۆمانیەکان بە خەڵات بیدەن بە (کایسیلۆس) [٥] و «بلاوتۆس» [٦] • بەڵام لە هەمان کاتدا لە (فێرجێل) [٧] و (ڤاریۆس)ی [٨] قەدەغە بکەن » [٩] •

(هۆراس) لەم چەند دێڕانەدا بەوپەڕی ئازایەتییەوە بەشداریی زۆرانبازیی نەمری نێوان کۆن و تازەدەکات و بەرگری لە تازەکەرەوەکانی وێژە و زمانی هونەری دەکات و بە شێوەی پرسیار بڕیاری ئەوە دەدات کە لەبەر ئەوەی خەڵکی ڕێگایان لە وێژەرەکۆنەکان وەکوو (کایسیلیوس و بلاوتوس) لە داهێنانی وشەی نۆیباو نەگرتووە و مافی ئەوەیان پێداوون دەربڕینی نوێ سازبکەن ، پێویستە هەمان ڕەفتار لەگەڵ وێژەرە سەردەمیەکان وەکوو : (فرجیل و فاریوس) بکەن و نابێ لەم ڕەفتارکردنە سڵ لە کۆنە پەرستان بکەنەوە •

ئەم بڕیارەی هۆراس ئەگەر لەگەڵ بناغەکانی (ئەرستۆ) لە گواستنەوەی ووشە لە واتای فەرهەنگییەوە بۆ ئاوەڵواتا بەراووردی بکەین بە هەڵوێستێکی شۆرشگێر دەژمێرێ •

---

(٤) سیتیجۆس : واتە لەبەرکەری چەشنە بەرگێکی نەتەوایەتیی کۆنی ڕۆمانی : هۆراس ئەم ووشەیەی بۆ ڕۆمانیە کلاسیکییەکان کە بڕوایان بە هیچ گۆڕانێك نەبووە بە کارهێناوە .

(٥) کایسیلیۆس : هەستیارێکی ڕۆمانییە بە هۆنینەوەی هەڵبەستی گاڵتەوگەپ بە ناوبانگ بوو ، لە ساڵی ١٦٨ پ ــ ز کۆچی دوایی‌کردوە.

(٦) بلاوتۆس : بەناوبانگترین هەستیاری گاڵتەوگەپی ڕۆمانییە لە ساڵی ٢٥٤ پ ــ ز لەدایكبووە .

(٧) فیرجیل : گەورەترین هەستیاری ڕومانییە ، لەسەردەمی (هۆراس)دا ژیاوە و ساڵی (١٩) پ ــ ز مردووە .

(٨) فاریوس : هەستیارێکی ڕۆمانییە لەگەڵ (هۆراس)دا ئاشنایەتی هەبووە.

(٩) هەمان سەرچاوەی پیشوو ل ١١٢ــ١١٤ .

بەڵێ (هۆراس) لە ئازادیپێدانی وێژە تازەکەرەوەکان بۆ سازدانی ووشەی نوێباو سنوورێك لە بەرزی و بەهێزیی چێژ و بە دەستکاریەکی کەمەوە لە سەرچاوەیەکی یۆنانی وەرگرتن کێشاوە ، بەڵام بە بێ مشتومڕ ئەم سنوورە لە چاوی چواربناغەکەی (ئەرستۆ)دا یەکجار فراوان و بەرینە و بە هیچ جۆرێك ڕێگا بە لەدایكبونی زاراوەی نوێ و میتەفۆری پێویست ناگرێت •

جا با لەم ڕووەوە گوێ لەم ڕەخنەسازە بلیمەتە بگرین کە دەڵێت : «بۆچی شایەنی قایلبون نیە ئەگەر هات و توانای ئەووەم هەبوو هەندێ ووشەی نۆیباو بخەمە سەرخەزنەی زمانەکەمان کەچی بەرهەمەکانی (کاتووانێوس) [۱۰] ڕێگای ئەوەیان پێدرابوو بە داتاشینی ووشەی تازە بۆ واتای جۆربەجۆر زمانی باوك و باپیرانمان دەوڵەمەند بکات » [۱۱] •

(هۆراس) لێرەدا ئەرکی زمانیی سەرشانی ڕەخنەساز بەدیدەهێنێ و ڕاستییەکی (سیمانتیکیمان) بۆ ڕەچاو دەکات و دەڵێت :

نابێ دەرگای خەزنەی زمان کە سامانێکی نەتەوایەتییە لە ڕووی گۆڕانی ژیان دابخرێ ، دەبێ بە داتاشینی ووشەی نوێ واتا هەمیشە لەدایكبووەکان دەربخەین و ئەو خەزنەیە دەوڵەمەند بکەین • ئەگەر لە (هۆراس) بێینە پێشەوە و بپرسیت بۆچی ئەم ڕەخنەسازە لە نەریتی کۆمەڵایەتی و یاسای سروشتەوە وەڵامت دەداتەوە و دەڵێت :

«بە هەموو وەچەیەك ڕێگا دراوە و هەمیشە ڕێگایان پێدەدرێ بە گوێرەی باوی سەردەمەکەیان ووشە ساز بکەن ، هەروەکوو چۆن دارستان

(۱۰) کاتووانیوس : ڕەخنەسازێکی ڕۆمانییە لە سالی ۱٤۹ پ ـ ز کۆچی دوایی کردووە .
(۱۱) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ۱۱٤ .

پاش تێپەڕبوونی ساڵ گەڵاکانی دەگۆڕێتەوە و ئەوەی لە پێش‌دا سەوز بووبوو دەڕزێت ، هەروەها ووشەکانیش کۆترینیان زووتر بەرەو نەمان دەڕۆن ، بەڵام نۆی‌کانیان وەکوو وەچەیەکی تازە و پێ‌گەیشتوو و سەوز و بەهادارن »[12] هەڵبەتە ئەمە دەستووری ژیانە : هەموو سەردەمێک بیروباوەڕ و واتای تایبەتی خۆی هەیە ، بۆ ئەم بیروباوەڕ و واتایانە ووشە و زاراوە و دەربڕینی گونجاو چەسپێنراوە، بەڵام ئەم سەردەمە ووردە ووردە بەرەو مێژوو دەکشێتەوە و هەموو دەسەڵاتێکی لەگەڵ خۆی‌دا دەپێچێتەوە و دەرفەت بە دەسەڵاتی سەردەمێکی نۆی دەدات کە بیروباوەڕی تازە و واتای نوێ دەهێنێتیە کایەوە، ئەمجا ئەگەر وێژەران و زمانەوانانی ئەم سەردەمە زانستیانە نەیەن بە پیری ڕوداوەوە ووشە و دەربڕینی گونجاو بۆ پێویستی‌یەکانی سەردەمەکەیان بە هوێ داتاشین و لێکدان و ئاوەڵواتاو ڕێگاکانی تری خوڵقاندنی فەرهەنگی زمان ساز نەکەن ئەوە بە دەستی خۆیان نەونەمامەکانی زمانی نەتەوەکەیان ووشك دەکەن •

لە هەمان کاتدا بە پێچەوانەی ئەمەوە ئەگەر هات و بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستان و مافی سروشتی و فەرمانەکەیان بەجێ‌هێنا و بەگوێرەی چێژی نەتەوایەتیان و لەبەر تیشکی دەستووری زمانەکەیاندا ووشەی نوێ‌یان سازکرد هونەرمەندانە نەونەمامەکانی زمانەکەیان ئاو دەدەن و ڕێگای نەشونما و خەملاندنیان بۆ بەرەڵا دەکەن ، هەتاکوو دەبنە دارستانێکی سەوز و بەهادار • ئا بەم جۆرە (هۆراس) باسی ووشە و واتا بەر لە دوو هەزار ساڵ بەرپادەکات و دوو بنەواشەی زانستی و هونەریمان بۆ دادەڕێژێ :

بنەواشەی یەکەم : ووشە شوێن‌پێ‌هەڵگر و بەرهەمی واتایە •

بنەواشەی دووەم : هەموو زمانەوانێك دەبێ خولیای سازکردنی

---

(12) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل 114 •

ووشەی تازە بۆ واتای نوێ بخوات و نابێ دەستەوئەژنۆ بەرامبەر بە گۆڕانی ژیان دانیشێت و زمانەکەی بە هەژاری بهێڵێتەوە ، یاخود بە ووشەی بێگانە بۆ پێداویستیەکانی سەردەمەکەی زمانە شیرینەکەی پینە بکات •
ڕەخنەسازی هاوچەرخمان گەر بیەوێ ئەم دوو بنەواشەیە هەڵبسەنگێنێ و پلەی (هۆراس) لە جیهانی زانستی رەخنەسازی و ئاوەڵواتادا دەست‌نیشان بکات بۆی هەیە کە بڵێت : قسەکانی ( هۆراس ) هەموویان نەظەرین و پێویستیان بە بەڵگە و نموونە هەیە ، بەڵام ئەم ڕەخنەسازە نابێ ئەوە لە یاد بکات کە هۆراس باسەکەی لە قەوارەی هەڵبەستێکدا ئەنجام داوە و هەڵبەستیش ــ بێ‌گومان ــ کۆری نموونە و بەڵگەهێنان و لێکدانەوە و شیکردنەوەی بیروڕانیە • بۆیە نە ئێمە و نە کەسانی تر دەتوانن فەرامۆشی نرخی (هۆراس)بکەن و وەکوو ڕێ‌پێشاندەرێك بۆ چارەسەرکردنی کێشە و تەنگ و چەڵەمەی ووشەی نوێ‌باوو وێنەی هونەریی‌تازە و ئاوەڵواتای پێویست نەی‌دەنە قەڵەم •

## لۆنجنیۆس و دەربڕینی مێتەفۆری

لە رەخنەسازیی ڕۆمانیدا کتێبێك بە ناونیشانی (بەرزیی هونەری ڕەوانبێژی ) [١٣] ناوبانگێکی فراوانی دەرکردووە ، دانەری ڕاستەقینەی ئەم کتێبە نەناسراوە و مێژووشوناسەکان و ڕەخنەسازەکانیش لەسەر ناوی ئەو دانەرە یەك نین : هەندێکیان دەڵێن دانەرەکە ناوی (کاسیوس لونجانیوس ) بووە •

ئەم ناوەش تا سەدەی سێیەمی زایین بە کتێبەکەوە لکابوو ، بەڵام هەندێکی تریان دەڵێن : دانەرەکە ناوی (لۆنجانیۆس)ە • هەرچۆنێك بێت لێکدانەوەی ناوەڕۆکی کتێبەکە ئەوە دەسەلمێنێ کە دانەرەکەی لە سەدەی

(١٣) بەرزیی هونەری رەوان بێژی : سمو البلاغة .

یەکەمی زایینی‌دا ژیاوە و لەوانەیە ناوبانگی لە چارەکی کۆتایی ئەم سەدەیەدا دەستی کردبێ بە بڵاوبوونەوە •

دانەری (بەرزیی هونەری ڕەوانبێژی) لەسەر شێوازی ئەفلاتوون لە دانانی کتێبەکەیدا کە دەمەتەقێیە بیروڕاکانی خۆی دەگەیەنێ بە خوێنەران• هەرچەنـد نـابێ ئەوە تێ‌بگەین کە ئـەم دانـەرە لە بیروڕاکانی دەربارەی هۆنەری ڕەوانبێژی لاسایی ئەفلاتوون دەکاتەوە و لەسەر ڕێچکەی ئـەو دەڕوات • بەڵگەشمان لەسەر ئەم ڕاستی‌یە ئەوەیە ، دانەر باسی سروشتی لێکۆڵینەوەکەی دەکات و دەڵێت :

«لەوانەیە بێتەوە یادت ئەی (بوسنویاس تیرتیانوس)ی خۆشەویستم ئێمە کاتێك ووتارەکەی (سسلیام)مان لە بەرزیی (هونەری ڕەوانبـێژی)دا پشکنی بینیمان ئەو مافی تەواوی بابەتەکەی نەداوە، هەروەها نەیتوانیوە بە شێوەیەکی ڕوون هەست بە خاڵە بنەڕەتی‌یەکان بکات و هیچی بۆ خوێنەران نەهێناوەتەوە تەنها ئەوە نەبێ لە کۆمەڵ‌کاری‌دا کەمێك یارمەتی داوون ، لە کاتێکدا دەبێ ئەو یارمەتی‌یە ئامانجی سەرەکی نوسەر بێت •

هەموو ووتارێکی بژارکراو پێویستی بە دوو بابەت هەیە :

یەکەم : لێکدانەوەی بابەتەکە •

دووەم : ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێگایانەی دەمان گەیێنێتە مەبەست[١٤]

دانەر لێرەدا هونەری ڕەوانبێژیی بە بابەتێك لە بابەتەکانی زانست دەزانـێ کە شایەنی فێرکردن و فێربوونە و پێویستی سەرشانی بە ڕوونکردنـەوەی ئەم فێربوونە و ئەم فێرکردنە دەست‌نیشان دەکات ، بە پێچەوانەی ئەفلاتوونەوە کە هەروەکو بینیمان ئەم بابەتە لە بیروڕای‌دا دەست‌کەوتێکی خوایی‌یـە و وێژەر بە هۆی خۆرپە و ئیلهامەوە لە خواکانەوە وەری‌دەگرێت و بە هیـچ

(١٤) کتێبی النقد الادبی اسس النقد الادبی الحدیث ل ٣٩ •

جۆرێك لە ڕێگای مامۆستای فێرکەر و زانای دانەرەوە فـێری نـابێت •
سەرەنجام ئەم دانەرە بلیمەتە لەبەر تیشکی تیڕوانینێکی زانستیانە دەقی
وێژەیی شیدەکاتەوە و دەڵێت : «بەرزیی زمان گوێگرەکان ڕازی ناکات ،
بەڵکوو خۆشی دەخـاتە دەروونیانـەوە ، بـەلاّم لەڕێـگای هونـەری
ڕەوانبێژییەوە بەرزەکاریگەریەکی بێهاوتا و هێزێکی بە تەوژم بەسـەر
دڵی گوێگرەکاندا زاڵ دەبێـت ، لێهـاتوویی لە داهێنـان و پەیـڕەو و
ڕێکخستن لە بابەتەکەدا لە کارێك یان لە دوو کارەوە هەڵناقوڵێ ، بەڵکوو
زادەی کارێکی زۆر گرانە کە بە گشتی لە سازکردن و داڕشتنی بابەتەکەدا
دێتە بەرهەم [١٥] » کەوابوو دەقی وێژەیی بە لای ئەم دانەرەوە بەرهەمێکی
یەکگرتووە : بەرزیی زمانەکەی بە تەنها ڕەنگە خۆشیەکی کاتی ببەخشێ ،
بەلاّم هێزە نەمرەکەی لە بەیەکداچوونی زمان و بابەت و داڕشتن سازکردنیان
لە جۆرێکی هونەرییەوە هەڵدەقوڵێ • بۆیە ئەم دانەرە کە نزیکەی هەزار و
نۆسەد ساڵ لەمەوبەر ژیاوە بە هیچ جۆرێك ناڕوانێتە دەقی وێژەیی وەکوو
یەکیەتییەکی دەستکرد لە نێوانی زمان و بابەت یاخود فۆرم و ناوەرۆك ،
بەڵکوو بە بەرهەمێکی تێکسمڕاوی وای لەقەڵەمدەدا ئەگەر هـات و لـە
بنـاغەدا لە چەند توخم و ڕەگەزێك پێكهاتبێ هەمیشە وەکوو بوونێـکی
تاقە ڕەگەزیی هاتۆتەکایەوە •

جا با بزانین پێوەری دانەرەکەمان لەبەر تیشکی ئەم چەمەکە زانستیانەی
دەربارەی بوونی دەقی وێژەیی لە هەڵسەنگاندنی دەربڕینی هونەریدا چییە و
لەسەر چ بناغەیەکدا نرخی میتەفۆر دەستنیشان دەکات ؟ دانەر لە هەموو
تێبینییە ڕەخنەسازیەکانیدا دوو هەنگاو هەڵدەگرێ :

یەکەم : دەقێکی وێژەیی تۆمار دەکات وەکوو ئەم دەقە : «چەپـکە

---

(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٣ .

گرێك وەکوو شەپۆلی دەریا بەرەو ئاسمـــان هەڵـــدەدەم ، سەرباقـــەکان دەسوتێنم و دەیانکەم بە مشتێك خۆڵەمیش ، نەخێر سرودەکەی ئێستـــا ئاوازێکی بەرز نی‌یە ، (بۆریاس) جگە لە بلوێرژەنێك هیچی تر نیە [16]».

دووەم : هەڵسەنگاندنی دەربڕینە میتەفۆریەکانی دەقەکە بە چەنـــد بـــڕیارێکی ڕەخنەسازی کە لەسەر بناغەی بەراووردکردن و شی‌کردنەوە ئەنجامیـــان دەدات ، هـــەروەکوو ئەم بڕیارانـــە کە دەقـــەکەی پێشـــوو لێك‌دەدەنەوە و دەڵێن :

« ئەم وێنانە هیچ کارەساتێکیان تێدا نیە ، بەڵکو دەست‌کرد و درۆن : (چەپکەگڕ) و (هەڵـــدان بۆ ئاسمـــان) و لێکچوانـــدنی (بۆریـــاس) بـــە (شمشاڵژەن) و هەموو ئەوانەی کـــە ماونەتـــەوە چەنـــد لێك‌چوونێـــکی دەربڕینی شلەژاوون وێنەی ئاڵۆزیان کراوە بەبەردا زیاتر لەوەی کە بەرهەمی هێزی سۆز بن ، ئەگەر هەر یەکێك لەمانەمان لەژێر ڕووناکی ڕۆژدا پشکنی ووردە ووردە لە شتێکی ترسناکەوە دێنە خوارەوە بۆ شتێکی هیچ و پووچ. فـــوی بەتـــاڵ تەنانەت لە تراجیدیاشدا چاوی لێ ناپۆشرێ کە خۆی لـــە سروشتیا قەبەیە و ڕوو دەکاتە دەربڕینی دەنگ‌دەرەوە ، بۆیە وا بیردەکەمەوە کە ئەمە لەگەڵ گێڕانەوەی ڕاستی و ڕیالیزمدا ناگونجێت [17] » ئەم بڕیارە ڕەخنەسازیانە کە ئەو دەربڕینە میتەفۆریانـــە لـــە ئاولواتـــاو لێکچـــوون هەڵدەسەنگێنن نەخشەی ڕێبازێکی زانستیانە دەکێشن : میتەفۆر دەبـــێ بەرهەمی کارەسات و سۆزبێت و ڕازانەوەیەکی ڕووکەشی نەبێت ، ئەگینـــا وەکوو فووی بەتاڵ و قســـەی درۆ بـــە بەر گـــوێ‌دا دەڕوات و هیـــچ شوێنەوارێك لە هەست و دڵی گوێ‌گر و خوێنـــەردا بـــە جێ ناهـــێڵێ . هەروەها دەربڕینی میتەفۆری لە بیروڕای دانەرەکەماندا دەبێ لە شـــوێنی

(١٦) بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٢ .
(١٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٨ .

خۆیدا بێت و ڕووەکی کێڵگەی خۆی بێت ، هەموو بابەتێك پێویستی بە میتەفۆر نیە و نابێ نووسەر هەمیشە و بە بێ پێویست پەنابباتە بۆ بەری بۆیە هەندێك لە دەربڕینە میتەفۆریەکانی (زەینەفۆن) لە کتێبە بە ناوبانگەکەیدا (ڕژێمی فەرمانڕەوایی لای اللاسیدیمونیەکان) هەڵدەسەنگێنی و دەڵێت :

«بیستنی دەنگەکانیان زەحمەت ترە لە بیستنی دەنگی پەیکەرە مەڕمەڕیەکان • گوڕینی چاو تێبڕینەکانیان گەلێ گرانترە لە لات لە گۆڕینی چاوتێبڕینی پەیکەرە برۆنزیەکان ، لە چاوەکانیاندا کچی زیندووت بۆ دەردەکەوێ کە خۆمان لەمان زیاتر شەرمن ترین • ناونانی بیلبیلەی چاو بە (کچی زیندوو) شایەنی قەڵەمی (أمفکرتیس)ە نەك قەڵەمی زەینەفۆن ، خوایە چەند سەیرە ئەگەر باوەڕمان وابێ کە بیلبیلەی چاوی ئەوانە شەرم دەردەبڕێت لەگەڵ ئەوەی کە ئەم پەندە بلاوە دەڵێت :

(خۆشەویستیی کەسێك شتێك دەرنابڕێ چەشنی چاو) هەر وەکوو (هۆمیرۆس) دەڵێت : (ئەی سەرخۆش ، دوو چاووت هەیە لە چاوی سەگ دەچن ) »[18] • دانەر لەم دەقەدا بێ گومان دەیەوێ بڵێ : دەربڕینی میتەفۆری بە کەڵکی پەخشانی زانستی وەکوو کتێبەکەی زەینەفۆن کە دانراوێکی یاساگەری و ڕامیارییە نایەت و بە ئاوازێکی ناساز دەبیسترێ، چونکە ئەم چەشنە دەربڕینانە بەرهەمی سۆز و ئەندێشەن و لە کارگەی هەست و دەروون و دڵی هەستیاردا سازدەکرێن و بە هیچ کلۆجێك بە هۆشمەندی و لۆجیکی نووسەری بابەتێکی مەوزوعی ئەنجام نادرێت •

بەراستی ئەم بیروباوەڕانە لە هەڵسەنگاندنی میتەفۆر و دانانی سنووری بەکارهێنانی و شیکردنەوەی سەرچاوەکانی جێگای سەرسوڕمانی مێژووشوناسی ڕەخنەسازییە ، چونکە تەمەنیان نزیکەی بیست سەدە

---

(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٠ .

دەبێت و لەو مێژووە دێرینەدا توانیویانە رێبازێکی زانستیانە بۆ ئەم بابەتە گرنگە لە ڕەخنەسازیدا بەرپا بکەن •

ڕەنگە نرخی ئەم ڕێبازە لەمەولا زیاتر بۆمان دەربکەوێ کە دەبینین زۆربەی نووسەرە کوردەکانمان لە باسەکانیاندا دەربارەی خوازە و خواستن و درکە ، شوێنپێی ڕێبازێکی ووشك و بڕیاردەری دوور لە شیکردنەوە و لێکدانەوەی سەرچاوەکانی ئەم هونەرە هەڵدەگرن •

# بــەشی دووەم

## مەجاز لە ڕەخنەسازیی عەرەبی‌دا

— سەردەمی پێش ئیسلام و باسی مەجاز •

— قورئانی پیرۆز و زمانی عەرەبی •

— لەدایك‌بوونی زاراوەی مەجازی عەرەبی •

— فەرامۆش‌کردنی (المجاز) لە رەخنەسازیی عەرەبی‌دا •

— ڕێبازی شی‌کردنەوەی مەجاز لە رەخنەسازی عەرەبی‌دا •

# سەردەمی پێش ئیسلام و باسی مەجاز

تەمەنی کۆنترین دەقی وێژەیی عەرەبی کە گەیشتۆتە دەستمان لە هەزار و حەوت سەد و پەنجا ساڵ پتر نیە ، ئەوەی لە مێژووی وێژەدا دانی پیانراوە ڕەخنەسازی لە دوای پەیدابوونی وێژەوە لەدایك بووە ، بۆیە وا چاوەڕێ دەکرا داهێنانی زانستی مەجازی عەرەبی کە بەشێکە لە ڕەخنەسازی لە دەوروبەری سەرەتای ئەو مێژووەوە دەستی پێ کرابێ ، بەلام ئەم چاوەڕێ کردنە بێ ئەنجام بوو چونکە بە درێژایی سەردەمی جاهیلی کە لە سەدەی یەکەمی زایینەوە دەست پێ دەکات و لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی زایینی بە پەیدابوونی ئاینی ئیسلامی پیرۆز کۆتایی هاتووە هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و زانستیمان لەو ڕووەوە چنگ ناکەوێت :

هەندێ دەنگ و باسی پچڕپچڕ لە چەند سەرچاوەیەکی کۆندا وەکوو کتێبی (الأغانی) [1] دەماودەم دەگێڕنەوە کە لە کۆتایی سەردەمی جاهیلیەت و لە بازاڕی (عوکاز)دا بە بۆنەی وەرزی کڕین و فرۆشتنەوە خێوەتێك بۆ هەستیارێکی بە ناوبانگ کە نازناوی (النابغة الذبیانی)یە هەڵدەدرا ، هەستیارەکانی عەرەب لەو خێوەتەدا هۆنراوەکانیان بۆ (نابیغة) دەخوێندەوە، ئەمجا ئەمیش بڕیاری لەسەر پەسندی و ناپەسندیان دەدا •

ئێمە ناتوانین لێرەدا بڕیارەکانی (نابیغة) وەکوو ڕووداوێکی مێژوویی هەڵبسەنگێنین ، بەلام ئەوەی بە دڵنیاییەکەوە دەتوانین بی سەلمێنین زاراوەی

---

(١) دانەری ئەم کتێبە (ئەبو فەرەجی ئەصفەهانی)یە •

(مەجاز) لەم سەردەمەدا بەکارنەهاتــووە ، هەرچەنــدە چەنــد بابەتێــکی مەجازی یاخود نزیك بە بابەتی مجازی وەکوو بەکارهێنانی دوو ووشە بــۆ یەك واتا و لادان لە بەکارهێنانی ووشەیەك بۆ ووشەیــەکی تر و ســازدانی ووشەیەکی نۆی بۆ واتایەکی تازە بە جۆرێــکی ســادە و ســاکار لیَیــان کۆڵراوەتەوە •

## قورئانی پیرۆزو زمانی عەرەبی

ئاشکرایە کە قورئانی پیرۆز ڕووداوێکی هونەری بەرزە جگە لەوەی پەیامێکی ئایینی پیرۆزە ، هەموو ئەو بەراووردانەی نێــوانی ناوەڕۆکــی قورئان و بابەتەکانی هــۆنراوەی ســەردەمی جاهیــلی کراوون ، تاقــە سەرەنجامێکی زانستییان دووپاتکردۆتەوە ، ئەم سەرەنجامەش ئەوەیــە : ناوەرۆکی قورئانی پیرۆز لە ڕووی بابەت و بیرۆکەوە بە هیچ جۆرێك لــە زۆربەی واتاکانی هۆنراوی جاهیلی ناچێت و هیچ وێژەرێــکی عــەرەبی سەردەمی جاهیلیەت و سەرەتای سەردەمی ئیسلام بە هۆنراو و پەخشان و قسەی ڕۆژانە توخنی واتای سوورەتەکانی قورئــان نەکەوتــون و ئــەم واتایانە کە لە باسی بیروباوەڕی ئایین و ئیسلام و یاسادانان بۆ کۆمەڵ و ڕێكخستنی پێوەندیی ئادەمیزاد بــە ئادەمــیزادەوە پێکهاتــوون تــازە و خوڵقێنراوون •

تــازەیی و خۆلقێنراوی واتاکانی قورئان لە ئاستی واتاکانی وێــژەی سەردەمی جاهیلیەت و ئیسلام ڕاستییەکی ســەرەکی دەچەسپێنێ ، ئــەم ڕاستییەش لە جیهانی زانستی زمانەوە کە بابەتی (مەجــاز) یەکێــکە لــە لقەکانی سەر دەردەهێنێ و دەڵێت : قورئانی پیرۆز کە زمانی عەرەبی بــۆ گەیاندنی واتا و بابەتەکانی هەڵبژارد ، ئەم زمانە پێویستی بە گۆڕاێــکی قوڵ و فراوان هەبوو بۆ ئەوەی لە ڕادەی بابەتەکانی وێــژەی ســەردەمی

جاهیلی بەندبێتەوە و خۆی بگەیەنێتە ڕادەی واتـا و مەبـەستە تـازە و خولقێنراوەکانی ئایینی ئیسلام •

لێکۆڵینەوەی زمانی قورئـانی پـیرۆز و بـەراووردکردنی واتـای ووشەکانی لەگەڵ واتای هەمـان ووشـە کە لە سـەردەمی جاهیلیەتـدا بەکارهاتوون ، گەیشتوونەتە سەرەنجامێك کە دەڵێ : ڕێگای ( مجـاز ) فراوانترین هۆی بووە لەبەر دەستی زمانی عەرەبیدا بۆ دەربڕینی بیرۆکە و واتا تازەکانی ئەم کتێبە پیرۆزە •

بۆ نموونـە لە سـەردەمی جاهلیەتدا ووشەی (الزکاة) بە واتـای (نەشونماکردنی ڕووەك ) هاتووە و ووشەی (الشریعة) بۆ واتای ( ئـاوی سازگار) بەکارهاتووە و ووشەی (الرکوع) بۆ واتای (قاچهەڵخلیسکاندن) سازکراوە •

بەڵام ئەم ووشانە لە قورئانی پیرۆزدا لە ڕێگای مەجازەوە واتاکانیان گۆڕراوون : ووشەی (الزکاة) بۆ مەبەستی (باجێکی ئایینی) دێت و ووشەی (الشریعة) بۆ دەربڕینی مانای یاسای ئایینی ئیسلام ئەنجام دراوە و ووشەی (الرکوع) (بۆ گەیاندنی بزووتنەوەیەك لە بزووتنەوەکانی نوێـژی ئـایینی ئیسلام) بەکارهاتووە •

بە تێڕوانینێکی تایبەتی خۆمان پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گەیشتینە ئەوەی کە لە زمانی قورئانی پیرۆزدا سێ چەشن لە مەجاز هەیە :

**یەکەم : مەجازی ئایینی :**

ئەم چەشنە مەجازە لە کۆمەڵە ووشەیەك پێكهاتووە کە بۆ سیفـاتی خوای گەورە و میهرەبان بەدیدەکرێن : وەکوو ووشەی (دەست)و (قاچ)و (لا)و (عەرش)و (هاتن)و (چوون) هتد •

بێ گومان لە قورئانی پیرۆزدا کە دەووترێ ( ید اللــه ) مەبەست لە ووشەی (ید) دەستی ئادەمیزاد نیە و واتای (جنب) (لا) نیە و (عرش) بۆ واتای کورسی و شتێکی قەوارەدار نەهــاتووە و (جاء) مەعنای هــاتنی شتێکی هەستپێکراو ناگەیەنێت ٠ کەوابوو ئەم ووشانە مەجازن و دەبــێ لەبەر بڕوامان بە ئایینی ئیسلام کە (خوا)ی گەورە و میهرەبان بە بێ هاوتا و تاقانە بە ئێمەی ناساندووە ، واتای ئەو ووشانە و ئەوەی لە زمانی قورئاندا لەو ووشانە دەچن بە جۆرێکی وا دەستنیشان بکەین کە لە مانای زمــانی پێشووەکانیان نەچن و جیاوازییــەك لە نێوانیــان و مەبەستەکانیــان لــە فەرهەنگی عەرەبیدا سازبکەین ٠

**دووەم : مەجازی زاراوەیی :**

قورئانی پیرۆز ژمارەیەك لە ووشەی عەرەبــی وەکوو (الفســوق) و ( الزکاة ) و (الرکوع) و (الشریعة) و (السجود) و (الدین) و (الصلاة) ٠٠٠ هتد ٠ لە واتا عەرەبیە پێش ئیسلامیەکانیانەوە بۆ چەند واتایــەکی نــوێ گواستەوە و کردنی بە زاراوەی وا کە لە فەرهەنگی عەرەبیــدا بۆ واتــا تــازەکانیان بەکارهاتوون و ئەم فەرهەنگەش وەکوو ووشەیەکی نوێ‌بــاو شوێنیان بۆ کردۆتەوە و واتا تازەکانیان بە سەربەخۆیی لە واتا دێرینیەکانیان دەستنیشان کردووە ٠

**سێیەم : مەجازی هونەری :**

مەبەستی قورئانی پیرۆز لە گەیاندنی بیروباوەڕی ئایینی ئیسلام بــە خەڵکی بە دوو هۆ هاتۆتەدی ٠

یەکەم : ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕ و تێگەیاندنی ٠

دووەم : بزواندنی هەست و نەست و کارتێکردن ٠

ئەم دوو هۆیەش بە ووشە و دەربڕینــی مەجــازی ئەنجامدراوون

بۆنموونە ، کە خوای گەورە و مەزن فەرمودەی ملکەچ‌کردنی ڕۆڵە بۆ دایکی و باوکی داوە ، لەم ئایەتەدا دەری‌خستوە : « واخفض لهما جناح الذل من الرحمة» [٢] واتە : باڵی ملکەچی بۆ دایکت و باوکت شۆڕکە • لێرەدا بە دەربڕینێکی مەجازی لە قەوارەی باڵندەیەکدا نوێنراوە ، ڕۆڵەش کە دەبێ یەو ڕووداوە هەستێت لە وێنەی باڵداریکی الاواز لە خزمەتی باوك و دایك‌دا ملکەچ و وەلامدەرەوەی هەموو داواکاریەکانیان بێت • ئەم چەشنە مەجازە کە بە ئاوەڵناوی هونەری ناومان بردووە بڕبڕەی زمانی قورئانی پیرۆزە و یەکێکە لە هەرەتایبەتیەکانی روخساری زۆربەی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز • ئەگەر لە ڕادەی ڕۆشن‌بیری خێزانی موسڵمانان لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆز بکۆڵینەوە بۆ ئەوەی بزانین ئایا هەموویان لە چۆنیەتی تێ‌گەیشتنیان لەیەك ڕادە بوون ، بۆمان دەردەکەوێ کە بە هیچ جۆرێك وا نەبوون : چونکە لە ناو ئەو خێزانەدا جگە لە میللەتی عەرەب بێگانە و نەزانی زمانی عەرەبی هەبوو شان بەشانی ئەمانەش خوێندەوارو نەخوێندەوار و پیر و لاو و ژن و پیاو بەرچاو دەکەوتن • جا لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدات و دەپرسێ : ئایا موسڵمانەکانی سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز کە ڕادەی ڕۆشن‌بیریان یەکسانی نەبوو : پێویستیان بە لێکدانەوەی چەشنەکانی مەجاز لە زمانی قورئانی پیرۆزدا هەبوو یاخود بە بێ لێکدانەوە ڕاستەخۆ لەم زمانە تێ‌دەگەیشتن ؟ •

دەگێڕنەوە کە ئایەتی (وکلوا واشربوا حتی یتبین لکم الخیط الأبیض من الخیط الأسود ) [٣] : واتە بخۆن و بخۆنەوە هەتاکوو هێڵی سپی لە هێڵی ڕەش بۆتان جیا دەبێتەوە • هاتەخوارەوە ، یەکێك لە هاوڕێکانی

---

(٢) سوورەتی (الاسراء) : ئایەتی ٢٣ .

(٣) سورەتی البقرة : ئایەتی ١٨٧ .

(پێغمەر) (د•خ) ناوی (عدی کوڕی حاتم) بوو پەتێکی سپی و یەکێکی ڕەشی لە ژێر سەرینەکەیدا دانابوو لە شەوانی ڕەمەزاندا هەر خەریکی دەرهێنان و تەماشاکردنی ئەو دووپەتە بوو • هەوڵی دەدا کە سپیەکە لە ڕەشەکە جیابکاتەوە ، بۆ ئەوەی بزانێ کاتی ڕۆژووگرتن دەستی پێکردووە یان نەء ؟ ڕۆژێ لە ڕۆژان (عەدی) ڕووی کردە پێغەمبەر (د•خ) پرسی ئایە مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە چیە ؟ دەزووی سپی و دەزووی ڕەشە ؟ پێغمبەر (د•خ) لە وەلآمدا فەرمووی :

پیاوێکی ملهوڕی لەم ئایەتە تێناگەیت ؟ مەبەست جیاکردنەوەی شەوە لە ڕۆژ [٤] ئەم ڕووداوە دوو ڕاستی مێژوویی دەربارەی لێکۆڵینەوەی مەجاز لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا ڕەچاودەکات :

**راستی یەکەم :**

لیکۆڵینەوەی مەجازی عەرەبی لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆزەوە بەردی بناغەکەی دانراوە ، کەوابوو تەمەنی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەو سەردەمەوە هەتا ئێمڕو نزیکەی هەزار و چوارسەد ساڵ دەبێ •

**راستی دووەم :**

سەرەتای لێکدانەوەی مەجازی قورئانی پیرۆز لە سەر دەستی پێغمەر (د•خ) بۆ تێگەیاندنی موسڵمانەکان لە زمانی بەرزیی‌هونەری قورئان ئەنجام دراوە •

## لەدایكبوونی زاراوەی مەجازی عەرەبی

مێژوونووسی مەجازی عەرەبی بۆی هەیە لێرەدا بپرسێ ئایا لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆزدا بە گشتی و فەرموودەکانی

---

(٤) بڕوانە کتێبی (معانی القران) بەرگی یەکەم ل ١١٤ •

( پێغەمەر ) (د•خ) کە مەجازی قورئانیان لێکداوەتەوە بە تایبەتی زاراوەی مەجاز هاتووە ؟

پشکنینی هەموو دەقەکانی ئەم سەردەمە وەڵامی ئەو پرسیارەدەداتەوە و دەڵێ : نەخێر ، هەرچەندە لەم سەردەمەدا تا ڕادەیەك لە مەجازی قورئاندا کۆڵراوەتەوە ، بەڵام هیچ کاتێك زاراوەی مەجاز بەکارنەهێنراوە •

هەروەکوو بۆمان دەرکەوتووە ئەم زاراوەیە لە سەرەتای سـەدەی دووەمی کۆچی‌دا لەدایك‌بووە : دەگێڕنەوە (الجعدی کوڕی درهم) کە ساڵی سەد و هەژدەی کۆچی مردوە و بە یەکێك لە خاوەن ئەهـواء دەنـاسرێ ووتویـەتی :

« ئەگەر هات‌و منداڵ بەرهەمی ژن‌هێنان بێت مـن دروسـت‌کەری منداڵەکانی خۆمم و کەسێکی تر دروست‌کەریان نیە ، کە دەووترێ خـوا خوڵقێنەرە یا نە ، ئەم ووتەیە مەجازە و حەقیقـەت نیە [1] لەم دەقـەدا دوو ووشەی کە دژی یەکترین (المجاز) و (الحقیقة) بەکارهاتوون : ووشـەی مەجاز کە کێشەکەی (مفعەلە) و لە بنچینەدا (مەجـوز) بووە لە دەربڕینـی (جاز المکان اذا تعداه) وەرگێڕراوە : واتە لە عەرەبیدا دەووترێ : ( جـاز المکان جوازا و مجازا وهذا مجاز القوم) • کەوابوو (المجاز) ناوێکە بـۆ ئەو شوێنەی کەپێی‌دا تێ‌دەپەڕێ و چاوگێکی میمیـیە بۆ کردارەکەی ، بەڵام ناوی شوێنەکە مەبەستی زاناکانی بەلاغەیە کە ئەم زاراوەیەیان بـۆ گواستنەوەی ووشەیەك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێـکی تر بەکارهێنـاوە ، زاراوەی ( الحقیقة ) بۆ ئەو ووشەیە بەکاردەهێنرێ کە لە شوێنی خۆیەتی و واتاکەی نەگۆڕراوە •

بەم پێیە (الجعد کوڕی درهم) کە زاراوەی (مجاز)ی لەو مێژووەدا

(١) کتێبی (الفصل فی الملل والاهوال والنحل) بەرگی چوارەم ل ١٥٣ .

به واتای دژواری (الحقیقة) بەکارهێناوە : مەبەستی ئەوە بووە کە بەڵێ : دروستکەری ڕاستەقینەی منداڵ باوك و دایکە و بەس ، ئەم مەبەستەش هەتا ئەمڕۆ بە جۆرێکی وا بەم زاراوەیەوە لکاوە و لێی جیانابێتەوە •

## فەرامۆشکردنی (مەجاز) لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا

هەستیار لە سەردەمی جاهیلیەتدا پلەیەکی بەرزی هەبوو بە سەرکردەی خێڵەکەی دەژمێررا ، بۆیە ئایینی ئیسلام هەڵوێستی تایبەتی خۆی دەربارەی ناوەڕۆکی هۆنراو نواندو قورئانی پیرۆز لە باسی هەستیاران فەرموویەتی : (بسم الله الرحمن الرحیم والشعراء یتبعهم الغاوون • الم تر أنهم فی کل واد یهیمون • وانهم یقولون ما لایفعلون • الا الذین آمنوا وعملوا الصالحات وذکروا الله کثیرا واتنصروا من بعد ما ظلموا وسیعلم الذین ظلموا ای منقلب ینقلبون ) [٢] واتە بەدکردارەکان شوێنپێی هەستیارەکان هەڵدەگرن کە لە هەموو کۆڕێکدا سەرگەردانن و کرداریان لەگەڵ گوفتاریاندا یەك نیە ، جگە لەوانەی بڕوایان هەیە و کردەوەی چاك دەکەن •

هەستیارەکان لەبەر تیشکی ئەم ئایەتانەدا دوو تاقمن : ئەگەر بمانەوێ ئەم دوو تاقمە هەڵبسەنگێنین و بزانین تا چ ڕادەیەك ئەم هەڵوێستەی ئایینی ئیسلام دەربارەی هۆنراوە کاری کردۆتە سەر باسی «المجاز» لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا دەتوانین بڵێین : تاقمی یەکەم لە هەستیاران : قورئانی پیرۆز بە دووڕوو داوئیەتە قەڵەم چونکە هەڵبەستەکانیان لە ڕاستیەوە دوورن و هەرچی وێنەی هونەری بە گشتی و (مجاز) بە تایبەتی لە ڕوخسارەکانیاندا بەکارهاتوون درۆن •

**تاقمی دووەم :**

کە قورئانی پیرۆز بە ڕێزەوە باسی کردوون : پەیام دار و ڕاستگۆن ،

---

(٢) سورەتی الشعراء : ئایەتی ٢٢٤ـ٢٢٧ •

بێ گومان زمانی هەڵبەستەکانیشیان ڕاست و لە درۆبەدەرن ، ئەم هەڵوێستەی ئایینی ئیسلام لە چاو تێڕوانینەکەی سوکرات و ئەفلاتون کە بە گشتی بڕیاری بێکەڵکی و ناڕاستی هەستیار و هۆنراوەی داوە زۆر وورد و زانستییە ، کەچی هەندێ لە زمانەوانان و مامۆستاکانی ڕەوانبێژی و زانا ئایینیبە موسڵمانەکان بە چاوێکی گومانەوە ڕوانیانە هۆنراو و باسی مەجازیان فەرامۆش کرد •

بۆ نموونە (سیبویه) [٣] کە زانایەکی دەستووری زمانی عەرەبییە و بە دورودرێژی لەم زمانەی کۆڵیوەتەوە دەربڕینی (المجاز)ی بە درۆ لەقەڵەم داوە و ووتویەتی :

«دەربڕینێك هەیە لە ڕووی واتاوە درۆیە هەروەکو بڵێیت چیاکەم هەڵگرت و ئاوی دەریاکەم خواردەوە» [٤] هتد کەواتە : (سیبویه) هەموو دەربڕین و ڕستەیەکی مەجازی هەرچەندە لەسەر دەستووری زمان ڕۆیشتبێت و بە پێچەوانەی داڕشتنی ڕێزمانی نەهاتبێ درۆیە و لەگەڵ هۆشمەندی و لۆجیكدا ناگونجێت • جا لێرەدا ڕەنگە بۆ هەندێ مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی عەرەبی هەبێ کە بڵێین : ئەم بڕیارەی (سیبویه) هیچ پێوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە هەڵوێستەکەی ئایینی ئیسلامەوە دەرهەق بە تاقمی یەکەمی هەستیارەکانەوە نیە ، بگرە لەسەر چاوەیەکی یۆنانیەوە هەڵقوڵاوە •

بەڵام جگە لە (سیبویه) بە دەیان زانا سوورن لە سەر ئەوەی کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی (پێغمەر)دا (د•خ) هیچ ووشەیەکی (مەجاز)ی نەهاتووە و لە زمانی عەرەبیدا مەجاز نیە ، لەم زانایانە ( محمد

---

(٣) سیبویه : ساڵی سەد و هەشتا و هەشتی کۆچی مردووە •
(٤) بڕوانە کتێبی (الکتاب) ب ١ ل ٨٧ •

کوڕی الکرام) و (علی کوڕی حزم)وه زۆر ئاشکرایه ئەم تاقمه که ئینکاری بوونی مەجازیان دەکرد و هەڵوێستەکەیان له سۆزێکی ئایینییەوه هەڵقولاّبوو، پاپشتیان به هیچ باسێکی زمانەوانی و ڕەوانبێژییەوه نەدەبەست •

ڕاسته کوڕی (حزم) هەوڵی دا که به قیاس و منطق ئەو هەڵوێسته بسەلمێنێ ، بەلاّم تا ڕادەیەکی زۆر له زمان و ڕەوانبێژی و ڕەخنەسازیەوه دوور بوو ، هەتاکوو کوڕی (تیمیه) که ساڵی حەوتسەد و بیست و هەشتی کۆچی مردووه هاته ئەم کۆڕەوه و بەرەنگاری ئەم پرسیارانه بوو : ئایا له زمانی عەرەبیدا ووشه هەیه یاسادانەری ئیسلام له واتا پێشوەکەیەوه بۆ واتایەکی نوێی گواستبێتەوه؟یاخود ئەم ووشانه لەیاسای ئیسلامدا به واتا پێشووەکانیان ماونەتەوه ، بەلاّم (یاسادانەری ئیسلام) له ئەحکامەکانیاندا زیادەیان خستۆته سەر و به هیچ جۆرێك واتاکانیان نەگۆڕیوه ؟ •

ئایا (یاسادانەری ئیسلام) هەروەکوو چۆن خەڵکی به گوێرەی (نەریت) واتای ووشه دەگۆڕن دەستکاری ووشەکانی کردووه و ئەم ووشانه له چاوی زماندا (مەجاز)ن و له چاوی (نەریت)ی یاسادانەری ئیسلامدا حەقیقین ؟ •

کوڕی (تیمیه) وەلاّمی ئەم پرسیارانەی داوەتەوه و ووتویەتی : « یاسادانەری ئیسلام نه ئەم ووشانەی گواستۆتەوه و نه دەستکاری کردوون ، بەڵکو به جۆرێکی سنووردار بەکاریهێناون »(٥) • ئەم زانایه لەبەر تیشکی ئەو تێبینییەدا کێشەیەکی زانستیانه لەگەڵ ئەوانەی دەڵێن له زماندا مەجاز هەیه بەرپاکرد و چوار بناغەی چەسپاند :

یەکەم : ووشه خۆی له خۆیدا نه حەقیقەته و نه مەجاز •

دووەم : ئێمه ناتوانین واتای یەکەمی ووشەیەك به بەڵگەی مێژووی

---

(٥) بڕوانه کتێبی (الایمان) ل ٢٧ •

ڕاست دەستنیشان بکەین بۆ ئەوەی بڵێین ئەم واتایە حەقیقیە •

سێیەم : واتای مەجازی ڕاستەوخۆ دەرناکەوێت •

چوارەم : واتای ووشەی بە ڕستەکەی دەچەسپێ و ئەو ووشانەی کە لە گەڵیا بەکارهاتوون واتەکەی دەستنیشان دەکەن •

سەرەنجام (کوڕی تیمیە) بڕیارێك دەدا و دەڵێت : «دابەش کردنی ووشە بەسەر حەقیقەت و مەجازدا ناڕەوایە ، بۆیە واتای هەموو ووشەیەك لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمەردا (د•خ) بەو ووشانە بەستراونەتەوە کە بە ڕستە مەبەستەکەیان دەخەنە ڕوو ، لە ئاکامدا هیچ ووشەیەکیان مەجاز نیە بەڵکوو هەموویان حەقیقین »[٦] •

بە لای ئێمەوە ئەم ڕێبازەی کوڕی (تیمیە) هەرچەندە هۆی بەرپابوونی سۆزێکی ئایینیەو ، بەڵام لەسەر بناغەیەکی زمانەوانی پتەو دامەزراوە و لەگەڵ سروشتی زمانی عەرەبیدا دەگونجێ کە واتای ووشەکانی بە هوێ ڕستەکانیەوە نەبێ هەرگیز دەستنیشان ناکرێت •

بۆ بەڵگە واتای ووشەی (الدائرة) دەشێ (بازنە) بێت وە دەشێ بارەگایەکی میری بێت ، بەڵام ئەگەر هاتو لە ڕستەیەکدا بەکارهێنرا و ووترا «رسمت الدائرة» ئەوە ڕاستەوخۆ واتاکەی دەردەکەوێ و تێدەگەیت کە مەبەستی قسەکەر بازنەیەکە و بارەگای میری نیە ، هەروەها ئەگەر ووترا ( ذهبت الی الدائرة ) ئەم ڕستەیە دەیسەلمێنێ کە ووشەی الدائره بە واتای بارەگایەکی میری هاتووە •

هەرچۆنێك بێت ڕێبازەکەی کوڕی (تیمیە) و قسەکانی ئەوانەی بەر لە کوڕی (تیمیە) فەرامۆشی مەجازیان کرد و دانیان بە بوونی لە زماندا

---

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٩ •

نەنا ، دەنگدانەوەیەکی بە تینە دژی ڕێبازێکی تر ، کە بە بێ سنوور بە بێ دەستوور دەقە ئاینییەکانیان لەسەر بناغەی مەجاز لێکدەدایەوە و پەیڕەوی کەرەکانی کە ئەندامانی تاقمە مەذهەبی و فەلسەفیەکان بۆ سەلماندنی بیروڕا تایبەتیەکانیان زمانی قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغمەریان (د•خ) ڕاڤە و تأویلدەکرد •

کوڕی (قتیبە) [7] کە ساڵی دووسەد و حەفتا و شەشی کۆچی مردووە باسی چۆنیەتی ئەو سەلماندنەی کردوە و ووتویەتی : هەموو ووشەیەك واتایەکی دەستنیشانکراوی هەیە ، ئەگەر هات و بە مەجاز بەکارهێنرا و دەبێ بۆ چەند واتایەکی ناسراو هاتبێت ، بەلام هەندێك لەوانەی خۆیان بە موسلمان دەژمێرن پەیڕەوی ئەم ڕاستیە زمانیەیان نەکردووە •

ئێمە نازانین تا چ ڕادەیەك ئەم تاقمە شوێنپێی سوفستاییەکانیان لە ڕەخنەسازیی یۆنانیدا هەلگرتووە و ئایا ئەم ڕیبازەیان لەوانەوە وەرگرتووە؟ بەلام ئەوەی بە دلنیاییەوە دەتوانین دووپاتی بکەینەوە ڕاستییەکە دەلێت: بە هوێ ئەم ڕێبازەوە واتاکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغمەر (د•خ) خەریك بوون لە خشتەی بەرن و مەبەستە پیرۆزەکانیان تێکدەن ، ئەگەر ئەو ڕێبازەی کوڕی (تیمیە) نەبوایە • هەرچەندە هەردوو ڕێبازی فەرامۆشکردنی مەجاز و ئینکارکردنی لە زماندا و ڕێبازی سەپاندنی مەجاز بە بێ سنوور و بە بێ دەستوور نەبوون بە هۆی گۆڕران و پەرەسندنی باسی مەجاز لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا •

---

(٧) بڕوانە کتێبی تأویل مشکل القرآن ل ٢٠٢ .

# ڕێبازی شیکردنەوەی مەجاز لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا

زۆربەی زمانەوانەکان و زاناکانی ڕەوانبێژیی عەرەبی دژی ڕێبازی فەرامۆش‌کردنی باسی مەجاز و ئینکاری بوونی لە زماندا ڕاوەستان و دەستیان بە بەرپەرچدانەوەی کرد • بەم جۆرە لە سەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچیەوە دەست‌کرا بە باسی مەجاز لە زمانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (د•خ) و هۆنراوە و پەخشانی عەرەبی و گەلێ کتێبی تری بە نرخ لەم باسەدا سازکرا وەکوو کتێبی (مجاز القرآن) دانانی (ابو عبیده) کە سالی ٢١٣ك مردووە •

ئەم بەرهەمە ڕەنگە یەکەم کتێبی عەرەبی بێت لەم ڕووەوە کە بە دەست گەیشتبێت ، دووا بە دووای ئەم کتێبە بە دەیان دانراو لە باسی مەجاز و هونەرەکانی تری ڕەوانبێژی کە پەیوەندیان بە مەجازەوە هەیە دانراوون وەکوو کتێبی ( تأویل مشکل القرآن ) دانانی کوڕی (قتیبە) و کتێبی (البدیع) دانانی کوڕی (المعتز) و کتێبی (اسرار البلاغة) و کتێبی ( دلائل الاعجاز) دانانی (عبدالقاهر الجرجانی) بەڕاستی ئەم کتێبانە لە بەرەبەیانی داهێنانی زانستی رەوانبێژیی عەرەبییەوە لەسەر بناغەی چێژی هونەری و ڕێبازی شیکردنەوە و لێکدانەوەی نموونەی بەرز لە ئایەتی قورئان و هۆنراوە و پەخشان باسی مەجازیان کردووە ، بەڵام وورده وورده بە هۆی زاڵبوونی زانستی لۆجیك و منطق و کزبوونی بزووتنەوەی وێژەیی ڕەسەن بەشداربوونی چەند دانەرێك لە زانستەکانی رەوانبێژیی عەرەبیدا کە لە چەشەی هونەریەوە دوور بوون باسی مەجاز لە چێژی نموونەی هونەریەوە دوورکەوتەوە و لە چوارچێوەی لێکدانەوەی لۆجیکی و گفتوگۆی ڕو کەشیدا نوقمی‌خوارد و سیس و ڕەق هەڵگەڕا •

هەرچۆنێك بێ ئەگەربمانەوێ هەموو باسە عەرەبییەکان دەربارەی

مەجاز کۆبکەینەوە و پوختەی ئەو باسانە بە بێ سەرنجدان لە جیاوازیی نێوان بیروڕای زاناکان پێش کەش بکەین دەتوانین بڵێین : مەجاز بەشێکە لە چوار بەشەکانی زانستی (ڕوونبێژی) [1] ، کە لە (لێکچواندن) [2] و (خوازە)[3] و (خواستە)[4] و (درکە) [5] پێك هاتووە .

بەشی (خوازە) دووا بە دووای بەشی (لێکچواندن) کە لەژێر ناونیشانی (خوازەی زمانی)دا [6] باس دەکرێ و بەوە دەناسێنرێ (ووشەیەکە بۆ مانا زمانیەکەی بە کارنەهاتووە بەڵکوو بۆ واتایەکی تر لەبەر پێوەندییەك بە کارهێنراوە لەگەڵ بەڵگەیەکی وا کە نەهێڵی مەبەست لەو ووشەیە (مانا زمانیەکەی) بێ پێوەندیی مانا زمانیەکەی ئەو ووشەیە و واتا تازەکەی دەشێ لێکچواندن بێت و ڕەنگە لێکچواندن نەبێ . بۆ نموونەی بەشی یەکەم دەڵێین : (لەگەڵ شێرێکدا قسەمکرد). ووشەی (شێر) لەم ڕستەیەدا بە مانای شێری ڕاستەقینە نەهاتووە ، بەڵکوو بە واتای مرۆڤێکی ئازا هاتووە . پێوەندیی نێوانی شێری بە مانای دڕندە و شێری بە واتای مرۆڤێکی ئازا لێکچوونی ئازایەتیە .

بۆ نموونەی بەشی دووەم دەووترێ (پۆلەکەهات) . بێ گومان ووشەی پۆل بۆ مانای (ژوری وانە) بەکارنەهێنراوە ، بگرە بە واتای قوتابی هاتووە .

پەیوەندیی پۆل بە مانای ژووری وانە بە پۆلەوە بە واتای قوتابی بێ گومان لێکچوون نیە ئەم پێوەندیە لە دانیشتنی قوتابی لە پۆلدا وەرگیراوە

---

(١) ڕوونبێژی : البیان .
(٢) لێکچواندن : التشبیه .
(٣) خوازە : المجاز .
(٤) خواستە : الاستعارة .
(٥) درکە : الکنایة .
(٦) خوازەی زمانی : المجاز اللغوی .

واته پەیوەندیەکی شوێنی‌یە • بەڵگەی (٧) خوازەش ڕەنگە دەربڕینێك بێت وەکوو ڕستەی (قسەمکرد) لە نموونەی (لەگەڵ شێرێکدا قسەمکرد) ڕەنگە واتایی بێت و لە چەمکی (٨) ڕستەکەوە وەرگیرابێت •

دووا بە دووای ئەم باسە (خوازەی زمانی) لەسەر بناغەی پێوەندیی نێوانی مانای زمانی ووشە و واتا نوێکەیدا بەسەر دوو لقدا دابەش‌دەکرێت:

لقی یەکەم پێی‌دەووترێ خواستە و لقی دووەم بە (خوازەی بەرەڵڵا)(٩) ناودەبرێت • پێناسەی خواستە بەوە پێشکەش دەکرێت کە چەشنێکە لە (خوازەی زمانی) و لە بنچینەدا لێکچواندنێکە (١٠) ، بەڵام یەکێك لە هەردوو بناغەکەی فڕێ‌دراوە و پێوەندییەکەی هەمیشە لێك‌چوونە • واتە کە دەڵێین : (لەگەڵ شێرێکدا قسەمکرد) ئەم ڕستەیە لە بناغەدا بەم جۆرە بووە (لەگەڵ مرۆڤێکدا قسەمکرد کە وەکوو (شێر) ئازا بووە ) : ووشەی (مرۆڤ) کە (لێچواوە) و ووشەی (وەکوو) ئامرازی لێکچواندنە و ووشەی (ئازا) ڕووی لێکچواندنە ئەمە هەموویان فڕێ‌دراوون و لەبریاندا ووشەی (شێر) کە (پێ‌لێچواوە) ماوەتەوە و ئەو ڕستەخواستەیەی ساز کردووە •

خواستە بە گشتی دوو جۆرە :

جۆری یەکەم : خواستەی (ڕاستەوخۆیە) (١١) کە ووشەی (لی‌چواو) لە ڕستەدا لێکچواندنیەکەی فڕێ‌دراوە • وەکوو ئەوەی کە دەووترێ (دەستی گوڵەکەم گوشی) •

---

(٧) بەڵگە : القرینة •
(٨) چەمك : المفهوم •
(٩) خوازە بەرەڵڵا : المجاز المرسل •
(١٠) لێکچوواندن لە دوو بناغە و دوو ڕەگەزی ناهەمیشەیی سازدەکرێ بناغەی یەکەم ؛ پێی دەووترێ (لێچواو) ، بناغەی دووەم بە ناوی (پێ‌لێچواو) ناودەبرێ • دوو ڕەگەزە ناهەمیشەیی‌یەکە ، یەکێکیان (ئامرازە) و یەکێکیان (ڕووی لێکچواندنە) •
(١١) خواستەی راستەوخۆ : الاستعارة التصريحية •

جۆری دووەم: (خواستەی شاراوە [12])یە کە ووشەی (پێ‌لێچواوەکە)ی لە ڕستەکەدا فڕێدراوە، وەکوو ئەم ڕستەیە: (ئەگەر مردن چڕنووکی گرت هیچ نووشتەیەك کەڵکی نابێت).

ئەم ڕستەیە لە بناغەدا بەم جۆرەی خوارەوە بووە (ئەگەر مردن کە وەك پڵنگە، چڕنووکی گرت هیچ نووشتەیەك کەڵکی نابێت)، ووشەی پڵنگ کە (پێ‌لێچواوە) فڕێدراوە و لەجیاتیدا ووشەی مردن (لێ‌چواوە) بەکارهێنراوە.

پاش ئەو دابەش‌کردنەی خواستە دووبارە لەسەر ڕەسەنی خواستراو بۆ دووپەل دابەش دەکرێ.

ئەگەر هات و خواستراو ناوێکی ڕەگەز [13] بوو واتە وەرگیراو نەبوو وەکوو ووشەی (شێر) کە ناوی ڕەگەزێکە و وەکوو ووشەی (کوشتن) کە چاوگێکە پێی دەووترێ (خواستەی ڕەسەن) [14] ئەگینا بە (خواستەی ناڕەسەن) [15] ناودەبرێت، چونکە ئەم لقە خواستەیە بۆکردار و ناوی وەرگیراو بەکارهاتووە پاش ئەوەی لە چاوگدا بەکارهێنراوە و هەروەها لە ئامرازدا بەکارهاتووە دوایی بۆ واتا گشتی‌یەکەی ئەو ئامرازە سازکراوە.

ئەگەر هات و لە ڕستەی خواستەییدا چەند ووشەیەکی تری پێوەندی‌دار بە خواستراوەوە هاتبوون خواستە بەسەر سێ بەشدا دابەش‌دەکرێ:

یەکەم: خواستەی (دووپات‌کراو [16]) کە جگە لە بەڵگەکەی ووشەیەکی گونجاو پتر لەگەڵ لێ‌خواستراوەکەی هاتووە وەکوو ئەم ڕستەیە کە دەڵێ

---

(١٢) خواستەی شارەوە: الاستعارة المكنية.
(١٣) ناوی رەگەز: اسم جنس.
(١٤) خواستەی ڕەسەن: الاستعارة الأصلية.
(١٥) خواستەی ناڕەسەن: الاستعارة التبعية.
(١٦) خواستەی دووپات‌کراو: الاستعارة المرشحة.

(شیرێکی کوڵکدارم لە گەرماو دی) لەم ڕستەیەدا ووشەی کوڵك لەگەڵ لێخواستراو کە دڕوندەکەیە گونجاوە واتای خواستەکە کە پیاوێکی ئازایە و بەهێزە دووپات دەکاتەوە •

دووەم : خواستەی نادووپاتکراو [17] کە بە ووشەیەکی گونجاو یان پتر لەگەڵ بۆ خواستراوەکەی بەر چاو دەکەوێ وەکوو ئەم ڕستەیە (شێرێکی پڕ چەکم لە گەرماوەکە دی) • لەم ڕستەیەدا ووشەی (پڕچەك) لەگەڵ بۆ خواستراو ــ پیاوەئازاکەــ گونجاوە واتای خواستەکە لاواز و نادووپاتکراو دەکات •

سێهەم : خواستەی (نەبەستراو) [18] کە ووشەیەکی گونجاو لە تەك لێخواستراو یان بۆ خواستراو نەهاتووە وەکوو (شێرێکم لە گەرماوەکە دی) •

خواستە لە ڕووی ژمارەی ووشەوە دوو بەشە •

یەکەم : (خواستەی سادە) کە لە یەك ووشە پێك‌هاتووە •

دووەم : (خواستەی لێکدراو) کە بەدەربڕینێك یاخود ڕستەیەکی تەواو کە زۆر جار پەندێکی پێشینانە ئەنجام دراوە •

سەرەڕای ئەم هەموو دابەش‌کردنە باسەکە دەگەڕێتەوە سەر خوازە و دەڵێت : خوازە دوو بەشە :

**یەکەم : خوازەی ژیری (١٩) :**

کە فەرمانێك یان ووشەیەك لە واتادا لە فەرمان چووبێت پاڵی بە

---

(١٧) خواستەی دوپاتکراو : الاستعارة المحددة .
(١٨) خواستەی نەبەستراو : الاستعارة المطلقة .
(١٩) خوازەی ژیری : المجاز العقلی .

ووشەیەکەوە درابێت کە بوێ نەبێت ، لەگەڵ بەڵگەیەکی وا ئەو بۆنەبووە بسەلمێنێ :

وەکوو (بەهار گوڵ دەچێنێ ) لەم ڕستەیەدا چاندنی گوڵ پاڵدراوە بە ووشەی بەهارەوە ، بەڵام ژیریی ئادەمیزاد بڕوا بەوە ناهێنێ وەکوو کارێکی ڕاست ، چونکە دەزانێ پاڵپشتی ڕاستەقینەی گوڵچاندن خوایە .

**دووەم : خوازەی بەرەڵلا (٢٠) :**

کە ووشەیەکە بۆ واتا ڕاستەقینەکەی بەکارنەهێنراوە ، بەڵکوو بۆ واتایەکی نوێ گواستراوەتەوە لەگەڵ بەڵگەیەك لە ڕستەکەدا کە بەکارهاتووە. ئەم بەڵگەیەش نیشانەیەکە بۆ واتا نوێکە و لادانی لە واتا ڕاستەقینەکەی .

بێ گومان لە نێوانی واتا ڕاستەقینەکەی خوازەی بەرەڵلاو واتا نوێکەیدا دەبێ پێوەندیەك هەبێت ، بۆیە ئەم چەشنە خوازەیە لەبەر تیشکی جۆر بە جۆری ئەم پێوەندیە بەسەر سیانزە چەشنی [٢١] سەرەکیدا دابەش دەکرێت کە ئەمانەی خوارەوەن .

یەکەم : ناونانی پارچەك لە شتێك بە ناوی هەموویەوە ، وەکوو (پەنجە دەخەنە گوێچکەیانەوە) واتە سەری پەنجە ، چونکە سەری پەنجە پارچەیەکە لە پەنجە .

دووەم : بەکارهێنانی بەشێك لە شتێك لەجیاتی هەمووی وەکو (چاوێك وا گوێمان لێدەگرێ) واتە سیخوڕێك چونکە چاو پارچەیەکە لە سیخوڕەکە.
سێیەم : بەکارهێنانی ناوێکی تایبەتی لەجیاتی ناوێکی گشتی وەکوو (ئێمە پێغەمەری خوای جیهانین) واتە : پیغمبەرەکان .

---

(٢٠) خوازەی بەرەڵلا : المجاز المرسل .
(٢١) بڕوانە کتێبی (الاتقان فی علوم القران) بەرگی دووەم ٦٧ـ٩٨ .

چوارەم : بەکارهێنانی ناوێکی گشتی لەبری ناوێکی تایبەتی وەکوو (بۆ ئەوانەی لەسەر زەویدان دەپارێنەوە) واتە بۆ خواپەروەرەکان •

پێنجەم : بەکارهێنانی سەرەنجام لەجیاتی هۆیەکەی وەکوو : ( لە ئاسمانەوە بەرهەمتان بۆ دەنێرینە خوارەوە) واتە هویّ بەرهەم کە بارانە •

شەشەم : بەکارهێنانی هۆ لە شوێنی سەرەنجام وەکوو : (توانای گویّڕاگرتنیان نەبوو) واتە بڕواهێنانیان بە خوا کە سەرەنجامی گویّڕاگرتنە •

حەوتەم : ناوبردنی شتێك بە ناوێك کە لە ڕابوردوودا بوێ بەکارهاتووە وەکوو (ماڵی هەتیوەکان بدەنەوە) هەتیو کە تەمەنی دەگاتە هەژدەساڵ بۆی هەیە ماڵی خوێ وەرگرێتەوە ئیتر لەو کاتەدا بەم ناوەوە ناونابرێت •

هەشتەم : ناونانی شتێکە بە ووشەیەك کە لە ئایندەدا بوێ بلوێت ، وەکوو (مەیدەگوشم) واتە ترێ دەگوشم چونکە مەی ناوی ترێیە پاش ئەوەی دەگوشرێ •

نۆیەم : ناوبردنی شوێنێك بە ناوی ئەوەی تێیدایە ، وەکوو ( لە ڕەحمەتی خوادا ئەوان نەمرن) واتە لە بەهەشتدا کە شوێنی ڕەحمەتی خوایە•

دەیەم : ناوبردنی تاقمێك بە ناوی شوێنەکەیانەوە ، وەکوو ( بە پۆلەکەم ووت) واتە بە قوتابیەکانم ووت •

یازدەهەم : ناونانی شتێك بە ناوی هۆیەکەیەوە وەکوو (زمانی عەرەبی زۆر پەرەی سەندووە) واتە ئاخاوتنی ووشەی عەرەبی کە هۆکەی زمانە •

دووانزەهەم : فەرامۆش کردنی ووشەیەك بە بەکارهێنانی دژوارەکەی لە جیاتیدا وەکوو (مژدەی ئێش و ئازارێکی گەورەیان بدەرێ) ، ووشەی

مژده بۆ هەواڵێکی خۆش بەکاردێت بەڵام لەم ئایەتەدا بۆ هەواڵێکی ناخۆش بەکارهاتووە •

سیانزەهەم : بەکارهێنانی دارشتەیەك [1] لەبری دارشتەیەکی تر وەکوو بەکارهێنانی چاووگ لەبری بکەر [2] بەبەکارهێنانی پێکراو [3] لەبری چاوگەکەی و بەکارهێنانی مێینە لەبری نێرینە •• لە پاشدا ئەم باسە (خوازەی بەرەڵڵا) وەکوو خواستە لە ڕووی ژمارەی ووشەوە دەکاتە دوو لقەوە :

خوازەی بەرەڵڵای سادە و ، خوازەی بەرەڵڵای لێکدراو •

لە زانستی واتادا [4] باسی خوازەی عەرەبی شوێنپێیەکی فراوان بۆ خۆی دەکاتەوە و قسە بەسەر دوو بەشدا دابەشدەکات :

بەشی یەکەم : (هەواڵ) [5] واتە ئەو قسەیە کە خۆی لە خۆیدا دەشێ ڕاست بێت و دەشێ درۆ بێت •

بەشی دووەم : (دەربڕین) [6] قسەیەکە کە لە خۆیدا نەڕاستە و نە درۆ ، هەواڵیش دوو بەشە :

یەکەم : هەواڵی ڕاستەقینە ، کە مەبەستەکەی گێڕانەوەی زانیارییەکە بۆ کەسێك کە نەزانێ ، وەکوو (چیای هیمالایە بەرزترین چیایە) •

دووەم : (هەواڵی خوازەیی) [7] کە مەبەستەکەی گێڕانەوەی زانیارییەك

---

(1) دارشتە : الصیغة .
(2) بکەر : الفاعل .
(3) پێکراو : المفعول به .
(4) زانستی واتا : علم المعانی .
(5) هەواڵ : الخبر .
(6) دەربڕین : الانشاء .
(7) هەواڵی خوازەیی : الخبر المجازی .

نیه ، بەڵکوو مەبەستێکی تری هەیە ئەم مەبەستەش بە گوێرەی نیازی قسەکەر و دەرفەتی قسەکە لێك‌دەدرێتەوە •

دەربڕینیش دوو بەشە :

دەربڕینی داخوازی و دەربڕینی بێ‌داخوازی • دەربڕینی داخوازیش پێنج بەشە • فرمان و نەهی و پرسیار و تکاکردن و ئاوات‌خواستن • هەر بەشێکیش لەم پێنج بەشە لەسەر بناغەی مەجاز دوو جۆرە :

جۆرێکیان حەقیقی و جۆرێکیان مەجازی‌یە •

کەوابوو فرمانی حەقیقی و فرمانی مجازی نەهی حەقیقی و نەهی مەجازی تکاکردنی حەقیقی و تکاکردنی مەجازی ئاوات‌خواستنی مەجازی و ئاوات‌خواستنی حەقیقی پرسیاری حەقیقی و پرسیاری مەجازی • لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەربارەی باسی مەجازی عەرەبی و ڕێبازی شی‌کردنەوەی لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا ڕاستی‌یەکمان بۆ دەسەلمێنرێ ، ئەم ڕاستی‌یەش ئەوەیە کە مەجاز لەگەڵ زۆربەی بابەتەکانی ڕەوانبێژی و زمان و زانستی زمان و بڕوای ئایینی‌دا تێکەڵاو بووە و هەروەکوو خوێ وایە کە هیچ چێشتێك بە بێ ئەو تامی نیە •

توێژەرەکانی سەردەمە دواکەوتووەکانیش بە ڕوکەش شیان‌کردۆتەوە و وەکوو دیاردەیەکی ڕواڵەتی لە قەڵەم‌یان داوە ، بە بێ ئەوەی بە دووای سەرچاوەکەی بگەڕین کە سۆز و هەڵچوونە و بە بێ ئەوەی سەرنج بۆ ئەرکی ئەندێشە لە ئەنجامدانیدا ڕابکێشن •

# بەشی سێیەم

# مینەفۆر لە رەخنەسازیی ئەوروپیدا

— زانستی مینەفۆر و رەخنەسازیی ئەوروپی •

— رێبازی شیکردنەوەی مینەفۆر لە رەخنەسازیی ئەوروپیی‌دا •

# زانستی مینەفۆر و ڕەخنەسازیی ئەوروپی

سەرچاوەی سەرەکیی هەموو چالاکیەکانی نەتەوە ئەوروپییەکان لە سەردەمی ڕاپەڕینی زانستیدا ڕۆشنبیری یۆنانی و ڕۆمانی بوو ؛ بۆیە مێژووناسەکان بە دڵنیاییەوە دووپاتی دەکەنەوە کە ڕەگ و ڕیشەی هونەر و وێژەی ئەو نەتەوانە لە کێڵگەی سامانی یونانی و ڕومانیدا خۆی داکوتاوە •

بەڵگەش ئەوەیە یەکەم هەنگاوی سەردەمی ڕاپەڕین بە وەرگێڕانی کتێبەکانی ئیفلاتون و ئەرەستۆ و شانۆگەریەکانی نووسەرە تراجیدیەکان و کۆمیدیەکانی یۆنان هەڵگیراوە •

ئەوەی لەم کتێبە وەرگیراوانە پەیوەندی بە باسەکەمانەوە هەیە کتێبی (بیوتیکا)ی ئەرەستۆیە کە جۆرجیوڤلا Giorgio Valla لە شاری بەندەقیە لە ساڵی ١٤٩٨ ــ زاینی بۆ یەکەم جار وەری گێڕایە سەر زمانی لاتینی و بڵاوی کردووە •

هەروەها نوسەرێکی ئەڵمانی کە ناوی (هرمن) بوو لە سەدەی سیانزەهەمی [1] زایینیدا وەری گێڕایە سەر زمانی ئەڵمانی و لە چاپیدا •

بەم جۆرە کتێبی (بیۆتیکا) بوو بە چرایەك بە دەست لێکدەرەوە ڕەخنەسازە ئەوروپیەکانەوە و لەسەر ڕێبازەکەی ئەرەستۆ لە ڕەخنەسازی بە گشتی و لە زانستی مینەفۆردا بە تایبەتی ڕابەری کردن •

ئەم ڕاستیە نابێ ئەوەمان لە یاد بکات کە زانستی مینەفۆر لە ڕەخنەسازیی

---

(١) بڕوانە کتێبی فن الشعر ل ١٢ــ١٣ •

ئەوروپیدا لە سەرەتای دامەزراندنیەوە ڕەچاو و یەکگرتوو نەبوو ، بەڵکوو زۆر جار بە ئاڵۆزاوی و تێکەڵوپێکەڵی دێتە بەرچاو .

نموونەی ئەم ئاڵۆز و تێکەڵوپێکەڵە ئەوەیە زاراوەی میتەفۆر کە لە لای ئەرەستۆدا پێناسەیەکی دەستنیشانکراوی بۆ دانرابوو ، لە ڕەخنەسازیی ئەوروپیدا زۆر جار دەکشێ و چەندەها بابەت لە بابەتەکانی هونەری ڕەوانبێژی دەگرێتە خۆی .

هەندێ لە ڕەخنەسازە ئەوروپیەکان ئەم کێشەیان دەستنیشانکردووە و سەرنجیان بۆ ڕاکێشاوە ، لەم ڕەخنەسازانە نووسەری ئینگلیزی بەناوبانگ (کرستیان)ە کە دەربارەی تێکەڵبوونی میتەفۆر بە لێکچواندن دەڵێ : «تێکەڵکردنی باسی میتەفۆر لەگەڵ باسی لێکچواندندا کارێکی سەرسوڕهێنەرە ، چونکە ئەم کارە هەر تەنها لە مەیدانی رۆژنامەگەریدا ڕووی نەداوە بەڵکوو لە لێکۆڵینەوە ئەکادیمیەکانیشدا کە دەربارەی زمانی هونەری سازکراوون بەرپابووە .

ڕاستی ئەوەیە زۆربەی ڕەخنەسازەکان میتەفۆر و لێکچواندنیان بە یەك دیاردە لە قەڵەم داوە ، ئەرەستۆ دەڵێ : لە نێوانی میتەفۆر و لێکچواندندا جیاوازیەکی ساکار و ڕوکەش هەیە :

میتەفۆر لێکچواندنێکی کورتە و هەر یەکێك لەم دوو باسە واتە (میتەفۆر) و (لێکچواندن) جێگای یەکتر دەگرن و شوێنەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکەن ، بەڵام لێکچواندن درێژترە بۆیە کارتێکردنی کەمترە و وەکوو میتەفۆر خۆشیەکی کاریگەر نابەخشێ .

بەم پێیە (سیزارو) لەو بڕوایەدا کەمیتەفۆر وێنەیە کە لە لێکچواندنەوە وەرگیراوە و لە یەك ووشەدا گوشراوە » (٢) .

---

(٢) Agrammar of metaphor (P. 13—14).

ئەوەی شایانی باس بێت ئەم بارەی زانستی میتەفۆر لە ڕەخنەسازیی ئەوروپیدا زۆربەی ڕەخنەسازەکانی خستە سەر گەردانیەوە و تووشی چەند هەڵەیەکی مێژوویی دەربارەی ئەم باسەکردن : بۆ نموونە هەردوو ڕەخنەساز (وندت)و (کلینر)[3] هەڵوێستە دێرینەکەی هەندێك لە زانا عەرەبەکان لە هەڵسەنگاندنی میتەفۆر دوپات دەکەنەوە و سوورن لەسەر ئەوەی میتەفۆر لە زماندا نیە ، بە بیانووی ئەوەی ووشە تەنها نیشانەیەکە بۆ هەستێکی گشتی و هەموو کاتێك جیاوازیەکی فراوان لە نێوانی دوو شتا بەدی دەکرێ ، سەرەنجام هیچ بەراووردێکی هەستپێکراو ئەو دوو شتە ناهێنێتە بەر چاو و سنووری لەیەك نەچونیان ناشکێنێ .

ڕەخنەسازی ئینگلیزی (هربتريد) دیارە هەستی بەوە کردوە کە دووپات کردنەوەی هەڵەی فەرامۆشکردنی میتەفۆر و ئینکاربوونی لە وێژەدا بە گشتی هەڵوێستێکی ناپەسەندە و لێکۆڵینەوەی زانستی لە سەدەی بیستەمدا بەرپەرچی دەداتەوە ، بۆیە نەیتوانی بڵێ میتەفۆر لە هەموو چەشنەکانی وێژەدا نیە ، بەڵام دەرگای پەخشانی لە ڕووی ئەمهونەرە ووشەییە داخست و ووتی : «میتەفۆر تەنها لەگەڵ جیهانی هۆنراو دەگونجێت و لە زمانی هەڵبەستدا بەدیدەکرێ »[4] .

(ریتشاردز) لە هەمان ڕووانگەوە کە دەیڕوانیە دەیان دەربرین وەکوو (پێی‌کورسی) و (قۆناغەی تفەنگ) و (ملی شوشە) دەی‌گوت : ئەم دەربڕینانە و سەدەهای دەربرینی‌وا لە یەکچوونێکی ڕواڵەتی نێوانی لەشی ئادەمیزاد و پارچەکانی قەوارەی بێ‌گیانەوە هەڵقولاون و تازە لە لێشاوی ووشەکانی زمانی ڕۆژانەدا تونراونەتەوە و هیچ کاتێك هەست بەوە ناکەین

---

(۳) Agrammar — of metaphor — p — n — 12.

(٤) بڕوانە کتێبی English Prons Style. P. 31.

که دەربڕینی میتەفۆرین ، بۆیە بڕیاردەدات کە میتەفۆر دوو جورە و دەبێ ئەم دوجۆرەش لە یەکتر جویَ بکرێتەوە :

یەکەم : میتەفۆری زمانی کە هیچ پێوەندیەکی بە هونەری میتەفۆرییەوە نەماوە و خویَ لە فەرهەنگدا وەکوو ووشەیەکی یەك واتایی و سەربەخۆ چەسپێنراوە •

دووەم : میتەفۆری هونەری کە گیانی هۆنراوە و بەرهەمی ئەندێشەیە (جۆرج کامبل) لەم دابەشکردنەی میتەفۆردا شوێنپێی (ریتشاردز)ی هەڵدەگریَ و دەڵیَ : جۆری میتەفۆر بابەتێکی رێزمانیە و زمانەوانەکان تەنها مافی لێکۆڵینەوەیان هەیە ، بەلاّم چەشنەکەی تری میتەفۆر واتە (میتەفۆری هونەری) باسێکی ڕەخنەسازیە و لە پسپۆری ڕەخنەسازەکاندایە • بەم پێوەرە (جۆرج کامبل) هەروەکوو لە قسەکانیەوە دیارە زانستی ئاوەڵواتا لە نێوانی زمان و ڕەخنەسازیدا پارچە پارچە دەکات و لە یەکتریان جویَدەکاتەوە •

زانای بەناوبانگ (فونت) زیاتر بەرەو ئەم ڕێگایە سنگ‌دەباتە پێشەوە و دەڵیَ : نابیَ بە هیچ جۆرێك نموونەکانی جۆری یەکەم بە میتەفۆر ناوببرێت چونکە هیچ فڕێکیان بەسەر زمانی هونەریەوە نییە [٥] هەرچۆنێك بێت نابیَ وا تیَبگەین کە ئەمبارەی زانستی میتەفۆر لە ڕەخنەسازی ئەوروپیدا جێگای لە توێژینەوەی ئەم هونەرە گرتووە و نەیهێشتووە ڕەخنەسازە ئەوروپیەکان قەڵەمی لێکۆڵینەوە لە کۆڕە فراوانەکەیدا بەکاربهێنن و بۆن و بەرامێکی نویَ و هاوچەرخی بدەنیَ و سامانە دێرینەکەی بخەنەگڕ و هەنگاوی گۆڕان و پەرەسەندنی پیَهەڵبگرن •

---

(٥) بڕوانە کتێبی (نظرية الأدب) ل ٢٥٣ .

# ڕێبازی شیکردنەوەی میتەفۆر
# لە ڕەخنەسازی ئەوروپیدا

هەروەکوو لەمەوبەر ووتمان باری ئینکاریبوونی میتەفۆر و فەرامۆشکردنی لە ڕەخنەسازیی ئەوروپیدا ڕێگای بە باسکردنی نەگرت و دەرگای لێکۆڵینەوەی لە ڕووی هەموو ڕەخنەسازەکاندا داخست ، بەڵگەشمان لەسەر ئەم ڕاستیە ئەوەیە کە بە دەیان کتێب و ووتاری بە نرخ لە ڕەخنەسازیی ئەوروپیدا بە هەموو زمانە ئەوروپیەکان لە باسکردن و شیکردنەوەی میتەفۆر دانراون •

ئەوەی لەم ڕووەوە شایەنی تێبینی و سەرنج لێدانە ئەو کتێب و ووتارانەیە کە لە ڕێبازی شیکردنەوەی میتەفۆردا پەیوەندیەکی پتەویان بە ڕەخنەسازیی یۆنانی و ڕومانیەوە هەیە •

دانەرەکانیان هەرچەندە بە هۆی کارتێکردنی زانستەکانی هاوچەرخ وەکوو زانستی دەروون و زانستی کۆمەڵ تا ڕادەیەکی زۆر لەو ڕێبازانەدا چەشنە گۆڕان و زیادە خستنەسەریان بەرپاکردووە ، بەڵام نەیانتوانیوە لە شوێنەواری (ئەرستو) و (لونجینۆس) خۆیان بپارێزن •

بۆیە ڕەخنەسازیی ئینگلیزی بەناوبانگ (کریستیان بروك رۆز) لە کتێبە بە ناوبانگەکەیدا (٦) کە لە ڕێبازەکانی شیکردنەوەی میتەفۆر دەکۆڵێتەوە و دەڕوانێتە سامانی یۆنانی و ڕۆمانی لە باسی میتەفۆردا ، ئەمجا ئەم ڕێبازانە بەسەر دوو جۆردا دابەش دەکات :

---

(٦) دەستووری خوازە : Agrammar of metaphor

یەکەم : ڕێبازە فەلسەفیەکان کە بەلای ناوەرۆکی بیری و هۆشمەندیەوە دەشکێنن •

دووەم : ڕێبازە زمانی‌یەکان کە خۆیان بە بابەتەکانی ڕێزمان و زمانەوانی‌یەوە دەبەستن •

ڕێبازە فەلسەفیەکانیش لە لای ئەم ڕەخنەسازەدا چوار نموونەی هەیە•

نموونەی یەکەم : دابەش‌کردنە بەناوبانگەکەی (ئەرستۆ)یە کە لەسەر بناغەی ڕەگەز و جۆری لۆجیکی میتەفۆر ، شی‌دەکاتەوە •

نموونەی دووەم : دابەش‌کردنی میتەفۆرە لە سەر بنەواشەی گیان‌لەبەر و بێ‌گیان ، ئەم بنەواشەیەش لە لایەن هاوبیرەکانی (ئەرستۆ)وە پەیڕەوی کراوە و لەبەر تیشکی‌دا چوار چەشن لە گواستنەوەی وشەی میتەفۆری دەست‌نیشان‌کراون :

یەکەم : گواستنەوە لە گیان لەبەرەوە بۆ (بێ‌گیان) وەکوو دەربڕینی (برۆی چیا) : وشەی (برۆ) بۆ گیان لەبەرە ، بەلام لەم دەربڕینەدا بۆ (چیا) کە بێ‌گیانە بەکارهێنراوە •

دووەم : گواستنەوە لە (بێ‌گیانەوە بۆ گیان‌لەبەر) وەکوو (ناوبردنی دوژمن بە شمشێر) وشەی (شمشێر) بێ‌گیانە لە دوژمن هاتووە کە گیان‌لەبەرە •

سێیەم : گواستنەوە لە (گیان‌لەبەرەوە بۆ گیان‌لەبەر) وەکوو بەکارهێنانی وشەی (شێر) بۆ ئادەمیزادێکی ئازا وشەی (شێر) و وشەی ئادەمیزادی (ئازا) هەردوکیان بۆ گیان‌لەبەر بەکاردێت •

چوارەم : گواستنەوە لە (بێ‌گیانەوە بۆ بێ‌گیان) وەکوو (بەکارهێنانی

لغاو بۆ کەشتی) لەم بەکارهێنانەدا (لغاو) و (کەشتی) هەردوکیان بۆ بێ گیان بەکارهاتوون •

نموونەی سێیەم : دابەش کردنی میتەفۆر لە ڕێگای بیرەوە • ئەم وێنەیە ئاسانترین ڕێبازە بۆ دابەش کردن و شی کردنەوەی میتەفۆر ، بەلام هەتا سەدەی نۆزدەهەمی زایین بە جۆرێکی تەواو ڕەچاو و پەیڕەوی نەکراوە •

بناغەی ئەم ڕێبازە لە مێژووی پەیدابوونیدا بۆ (سیزارو) دەگەڕێتەوە کە دەڵێ : (هیچ شتێك لەم جیهانەدا ووشە بێت یان واتا بۆ چەند شتێکی تر لەسەر بناغەی پەیوەندی بۆ بەکارهێنان نەشێت و ڕەوا نەبێت ) •

نموونەی چوارەم : شی کردنەوەی میتەفۆر لەبەر تیشکی پەیوەندیەکی گشتی و هاوبەشیدا :

ئەم شی کردنەوەیە لەسەر لایەك یان پتر لە یەکچوونی واتای وشەیەك و ئاوەڵواتاکەیدا دەڕوات و پشت بە پەیوەندی نێوانیان دەبەستێت •

(کریستیان) دووای ئەوەی سەرەنجی خوێنەرەکان ڕادەکێشێ بۆ نموونەیەکی تر لە ڕێبازە فەلسەفیەکان بۆ دابەش کردن و شی کردنەوەی میتەفۆر ، ئەوەش نموونەی پێنجەمە کە مەبەستەکەی لێکدانەوەی ئامانجی میتەفۆرە واتە : (چێژوەرگرتن و خۆشی بینین لە میتەفۆر) • ئەم ڕێبازە پووچەڵ دەکاتەوە و بەرپەرچی دەداتەوە ، ئەمجا ڕێبازە زمانیەکان کە بە لایەوە پەسندن پێش کەش دەکات و دەڵێت : ( چەشنەکانی میتەفۆر هەرچیەك بن لە واتایەکی گشتیەوە بۆ واتایەکی تایبەتی لە گیانلەبەرەوە بۆ بێ گیان لە مەبەستێکەوە بۆ مەبەستێکی تر گواسترابنەوە ــ دەبێ ڕێبازێکی زانستی وورد هەبێ بۆ چوونە ناوەوەیان و شی کردنەوەیان) • ئەم ڕێبازەش پشت بەستنە بە پارچەکانی ئاخاوتن ، چونکە میتەفۆر لە

ئاخاوتنەوە هەڵدەقوڵێ و کەرەسەی بڕبڕەی زمانی هونەریە •

لێرەدا (کریستیان) بیروڕای (تیبرسن) لە دەستنیشانکردنی پێنج پارچە سەرەکیەکەی ئاخاوتن کە (فەرمانو ، ناو و ، ئاوەڵناو ، و ئامراز ، و ڕاناو )ن دەهێنێتەوە یاد و دەڵێت : ئەم پارچەیە بنەڕەتی بن یان تەواوکەر بن لە زمانەکانی بنەماڵەی هیندو ئەوروپیدا بەدیدەکرێن ، بۆیە هەموو هەستیارێکی ئینگلیزی دەبێ بۆ میتەفۆر بەکاریان بهێنێ •

سەرەنجام (کریستیان) میتەفۆر لەسەر پارچەکانی ئاخاوتن دابەشدەکات و کتێبەکەی [7] کە گرنگترین باسە لە شیکردنەوەی ئاوەڵواتا سەردێرەکانی بەو پارچە ڕێزمانیانە ناونراون ــ ئاوەڵکردار ــ ئاوەڵناو ••• هتد لەبەر دەستی ئەم ڕێبازەی (کریستیان)دا پرسیارێک خوێ دەسەپێنێ و دەپرسێ : تا چ ڕادەیەك ئەم ڕەخنەسازە لە کاتی شیکردنەوەی دەربڕینە ئاوەڵواتایەکاندا بە تیشکی ڕێبازە زمانیەکەی خۆی لە تەوقی ڕێبازە فەلسەفیەکان ڕزگاری کردووە ؟ •

بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە ئێمە بیروڕامان وایە کە (کریستیان) تەنها لە ڕێكخستنی بەشەکانی کتێبەکەیدا پەیڕەویی ڕێبازە زمانیەکەی کردووە • بەلام لە شیکردنەوەی نموونە میتەفۆریەکانی ئەم باسانە ڕاستەوخۆ ڕێچکەی هەنگاوەکانی ڕێبازە فەلسەفیەکانی گرتووە •

بۆ بەڵگە کە سەرنجی لە ڕستەکەی (جۆفری فینسۆف) (مێرگەکان پێدەکەنن) داوە ووتویەتی : وشەی (پێدەکەنی) لە جێگای دەربڕینی (خۆشی بە گوڵ و گوڵزار) هاتووە • یاخود بە وەرگێڕانی وشە بە وشە لە جیاتی دەربڕینی (پڕ لە گوڵ و گوڵزار) بەکارهێنراوە •

بەلام پێی ناوێ ئەم وەرگێرانە پێشکەش بکەین هەروەکوو پرۆفیسۆر

---

( Agrammar of metaphor ) P. 4—5.

(کیز) دەڵێ : ئێمە لە یەکچوونی نێوانی دوو قسەی لە یەك نەچوودا تێدەگەین بەڵام بە هیچ کلۆجێك پێویست نیە ئەو لە یەك چوونە بهێنینە بەرچاومان و پەنجەی بۆ ڕابکێشین ، هەروەکوو چۆن ڕەفتار لەگەڵ دەربڕینێکی سادە و ساکار وەکوو ڕستەی (گوڵێکم دی) دەکەین چونکە ووشەی (گوڵ) واتا زمانی‌یەکەی دەبەخشێ ئەگەر هات و نەمانزانی بۆ واتا میتەفۆری یەکەی (ئافرەتێکی جوان) بەکارهێنراوە. کەچی وێنەی (میرگەکان لەکاتی پێکەنیندا ڕاستەوخۆ بە باڵی هێزی ئەندێشە دەگاتە زەینمان ) ، هەروەها ووشەی (مێرگەکان) دەبێتە گیانلەبەر و قەوارەدارێکی زیندووە. ئەم سەرنجلێدانەی (کرێستیان) بێ گومان ڕاستی‌یەك ڕەچاودەکاتەوە و دەیسەلمێنێ کە ئەم ڕەخنەسازە هەرچەندە دروشمی پووچکردنەوەی ڕێبازە فەلسەفیەکانی هەڵگرتووە ، بەڵام لە کاتی شی‌کردنەوەی دەربڕینە میتەفۆری‌یەکاندا پێویستی بە تیشکێك هەبووە لە ڕووناککردنەوەی ئەم ڕێبازە .

# بـــەشی چـــوارەم

## خوازە لە ڕەخنەسازیی کوردیدا

- خوازە لە لای مامۆستا سجادی .
- مامۆستا عەزیز گەردی و باسی خوازە .
- دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف و لێکۆڵینەوەی مەجاز .
- ئێمە و ئاوەڵواتا .
- سیماتتیك و ئاوەڵواتا .
- زاراوەی ئاوەڵواتا بۆچی ؟
- چەشنەکانی ئاوەڵواتا .
- ئاوەڵواتای فەرهەنگی .
- ئاوەڵواتای هونەری .

# خوازە لە ڕەخنەسازیی کوردیدا

لەو گەشتەی لەگەڵ میتەفۆر و مەجاز لە رەخنەسازیی یۆنانی و ڕۆمانی و عەرەبی و ئەوروپیدا کردمان ، کە نزیکەی دوو هەزار و پێنج‌سەد ساڵی خایاندوە وێنەی جۆر بە جۆری لە لێکۆڵینەوەی ئەم هونەرە پێشکەشی‌کردین ، بۆیە دەبێ ڕاستیەك ڕەچاوبکەین و هەمیشە بیهێنینە یادمان ئەم ڕاستیەش ئەوەیە :

باسی میتەفۆر و مەجاز لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیە و هەرچەندە لەسەر ڕێبازی زانستیانە لێکۆڵراوەتەوە ، بەڵام بوون و بەرامەی زمانەکەی و دەرفەتی کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕی نەتەوایەتی خاوەنی ئەو زمانەی پێوەیە.

جا بزانین تا چ ڕادەیەك ئەم ڕاستیە لە باسی خوازە : واتە میتەفۆر و مەجاز لە ڕەخنەسازیی کوردیدا دەنگی داوەتەوە ؟ .

ئایا ئەوانەی باسی ئەم هونەرەیان لە ڕەخنەسازیی کوردیدا کردووە لاسایی‌کەرەوە و شوێن پێ‌هەڵگرن، یاخود بە گوێرەی سروشتی زمانەکەیان و گیانی هاوچەرخ بەهرەدار و داهێنەرن ؟ .

بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە لەم بەشەی کتێبەکەماندا باسی خوازە و مەجاز لە لای مامۆستایان : (علاءالدین سجادی) و (عەزیز گەردی) و (دکتور عبدالرحمن مارف) دەکەین . ئەمجا سەرەنجی تایبەتی خۆمان پێشکەش‌دەکەین بە هیوای گەیشتن بە چەسپاندنی باشترین ڕێباز لە

لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی ئەم باسە گرنگە کە بڕبڕەی پشتی ڕەخنەسازییە •

## خوازە لە لای مامۆستا سجادی

ئەوەی بیەوێ چەمکی [1] میتەفۆر و مەجاز لە لای مامۆستا علاءالدین سجادی‌دا دەست نیشان بکات و بزانێت ئەم ڕەخنەسازە کوردە لە چ سەرچاوەیەکەوە بیروڕاکانی لەم باسەدا هەڵدەهێنجێ پێویستە هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ ناوەڕۆکی ناونیشانی (هونەرە قسەییە ئاشکرایەکان)دا [2] بڕوا ، چونکە مامۆستای ناوبراو لە دوو توێی ئەم ناونیشانەدا لابەلا لە میتەفۆر و مەجاز دەکۆڵێتەوە •

دەربڕینی (فنونی بەیانیە) کە مامۆستا سجادی بە (هونەرە قسەییە ئاشکرایەکان) وەری گێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی لە زانستی ڕەوانبێژیی عەرەبیدا بابەتێکی کۆنە : مامۆستاکانی ئەم زانستیە پاش ئەوەی ئەم بابەتەیان پێ گەیاند لە چوارچێوەی‌دا باسی سێ هونەری سەرەکیان کردووە کە (تشبیەو ، مجازو ، کنایەن) • کەچی مامۆستا سجادی گەڕاوەتەوە بۆ کۆنترین قۆناغی پێگەیشتنی ئەم بابەتە و چاوی بڕیوەتە کتێبی (البدیع)ی کوڕی (المعتز) کە لە نیوەی دووەمی سەدەی سێهەمی کۆچی‌دا ، وەکوو سەرەتایەکی ساکار لە عەرەبیدا دانراوە • بەڵگەشمان ئەوەیە مامۆستا سجادی لەم کۆڕەدا شوێن‌پێی‌کوڕی (المعتز)ی هەڵگرتوە کە ساڵی دووسەد و نەوەدو شەش کۆچی دوایی کردووە ، لە ژێر ناو نیشانی (فنونی بەیانیە)دا باسی (ڕەگەز دۆزی) ــ جناس ــ دەکات [3] کە هیچ پەیوەندیەکی بەم ناونیشانەوە نیە و مامۆستاکانی ڕەوانبێژیی عەرەبی پاش ئەوەی لقەکانی ئەم

---

(١) چمك : المفهوم •
(٢) بڕوانە ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی ل ٨٢ •
(٣) بڕوانە (ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی) ل ٨٢ •

زانسته لەسەر دەستیان دامەزراوە و پەرەیان سەندووە لە بابەتی (علم البدیع)دا لێی‌دەکۆڵنەوە •

هەرچۆنێك بێت مامۆستا سجادی (هونەرە قسەییە ئاشکرایەکان) تەنها لەبەر دوورو درێژی و تێکەڵبوونی زانستی (البیان) و (البدیع)ی عەرەبی بابەتەکانی (البدیع) باس ناکات و خێرا لاپەڕەکانی کتێبی (جواهر البلاغة فی المعان والبیان والبدیع) کە دانەرەکەی (احمد الهاشمی‌یە) و نووسەرێکی هاوچەرخە هەڵدەداتەوە و خۆی دەگەیێنێتە بابەتەکانی (البیان)ی عەرەبی و دەست بەوەرگێرانیان دەکات و بۆ هەر بابەتێکیان نموونەیەك لە وێژەی کوردی دەهێنێتەوە ، یان شاهدێکی عەرەبی دەکاتە کوردی •

لە سەرەتادا وەکوو هەموو باسکەرێکی ڕەوانبێژیی عەرەبی لە بابەتی (التشبیه) بەسەر دێڕی (لێچوون و لەوچوون) (المشبه والمشبه بە)[٤] دەکۆڵێتەوە ئەمجا دەچێت بۆ بابەتی (خواستن) کە بەرامبەر بابەتی (الاستعارە)ی عەرەبی دێت •

جا با بزانین ئایا ئەم چوونە زنجیرەی باسەکەی لە مامۆستا سجادی پچڕاندوە و ڕێبازی زاناکانی ڕەوانبێژیی عەرەبی کە باش بابەتی (التشبیه) و بابەتی (المجاز) باس دەکەن تێکداوە ، چونکە (الاستعارە) لە لایاندا بەشێکە لە مەجاز ، یاخود هەر دەیەوێ شت بە بێ نەخشە وەربگرێ ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر گرنگ نیە بەڵام ئەوەی بە لامانەوە گرنگە ئەوەیە: مامۆستا سجادی لە ڕێبازی شیکردنەوەی خواستن لەسەر ڕێچکەی دواکەوتووترین ڕێچکەکانی ڕێبازی عەرەبی لە لێکۆڵینەوەی (الاستعارە) دەڕوات و هیچ ئاوڕێك لە ڕەخنەسازیی هاوچەرخی خۆی ناداتەوە کە بە شێوازێکی نوێ و ڕێبازی خوڵقێنراو لەم هونەرە دەکۆڵێتەوە •

---

(٤) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٦ •

مامۆستا (سجادی) لە باسی خواستن‌دا دەڵێت : «وێنە بۆ (خواستن)یش وەکوو ئەم هۆنراوەی بێخودە :

کە دەرکەوت مانگی دوو حەفتە سەراپا پەردەی منەوەرکرد .
بە عنوانی سەفا دەستی جفای لەو ناوەدا دەرکرد .

(مانگی دوو حەفتە) مانگی شەوی چواردەیە هونەرمەند هێناویەتی و خواستوویەتی بۆ ڕوومەتی خۆشەویستەکەی وەکوو سەیردەکەین هەموو باسەکانی خواستن ئەم هۆنراوە دەگرێتەوە ، چونکە ئەوەبوو ووترا لە خواستن‌دا یەکێ لە ئەوزاری بە هێزی تشبیەکەی دەووترێ و هیچی تر . واتە لێچوون یا لەوچون ئیتر ئەوانی تر ناووترێن لێرەدا (لەوچون) کە مانگی دووهەفتەیە ووتراوە (لێ‌چوون) کە ڕوومەتی یارە نەووتراوە (ڕووی لێ‌چۆن) کە ڕووناکیە و ئەوزار نەووتراون . دیارە ئەوزاریش هەر نەووتراوە »[٥] .

ئەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ مێژووی ڕەوانبێژیی عەرەبی‌دا هەبێت باش دەزانێ کە مامۆستا سجادی ئەم قسانەی لەو کتێبانە وەرگرتووە کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا بۆ فێرکردنی قوتابیان وەکوو کتێبی (البلاغة الواضحة) دانراون ، تەنانەت دێڕە شعرەکەشی کە بۆ شی‌کردنەوە هێناوێیەتیەوە یەکێکە لەو دێڕە کوردیانە کە لە هونەری وشەسازی‌دا لاسای ڕەوانبێژیی عەرەبی دەکەنەوە و جوانی ڕوومەتی خۆشەویستەکانیان بە لێکچواندنی (البدر) دەردەخەن .

هەرچۆنێك بێت مامۆستا سجادی سەرەڕای ئەمانە هەمووی دەبوایە لە کۆتایی ئەو قسانەدا دەربارەی خواستن باسی مەجازی بکردایە ، بەڵام نازانین بۆچی چووە سەر لاپەڕەکانی باسی (الکنایە) لە کتێبە عەرەبیەکاندا و

---

(٥) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٨-٨٩ .

فەرامۆشی لاپەڕەکانی ئەم کتێبانەی کرد کە پێش ( الکنایـه ) لـە (المجـاز) دەکولنەوە ؟ •

بێ گومان هیچ مەبەستێکمان نیە گەر هویَ ئەم ڕووداوە سەیرە لـە هەڵەی ڕیزکردنی لاپەڕەکانی ئەو سەرچاوە عەرەبی‌یە بەدی‌بکەین کە لەبـەر دەستی مامۆستا سجادی‌دایە و هەموو قسەکانی لەوەوە وەرگرتووە ، چونکە هیچ هۆیەکی تر نیە کە پاڵ بە مامۆستای ناوبراوەوە بنێ دوابەدوای بابەتی خواستن باسی (گۆشە ــ درکە) (کنایە) بکات و (خوازە ــ مەجاز) لەدووای کنایەوە تۆمار بکات ، ڕەنگە شوێنی بـاس‌کردنی خـوازە بـە ڕواڵـەت مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ نەبێت ، بە تایبەتی ئـەگەر هـات و لەگـەڵ چۆنیەتی ئەم باس‌کردنەدا بەراوردکرا و پەردە لەسەر ڕادەی تێگەیشتنـی مامۆستا سجادی لە بابەتی‌خوازەدا ڕامالْکرا •

مامۆستا سجادی کە (خوازە)ی لە (خواسـتن) جیـاکردەوە و لـە نێوانیاندا باسی کنایەی چەقاند ، خوێنـەر بۆیەکەم جـار وا دەزانـی کە مامۆستای ناوبراو هیچ نەبێ جیاوازی (خواستن) لە (خوازە) بەلایەوە زۆر ئاشکرایە و ڕوونە کەچی ئەو نموونـەیەی کە بـۆ خـوازە هێناویەتـەوە نموونەیەکە بۆ خواستن • جا با بزانین ئەم نموونەیە چی‌یە ؟ •

مامۆستا سجادی کە لە باسی گۆشە ــ واتە کنایە ــ بوەوە ووتی : «ئەم باسە کە بۆ گۆشە کرا هەر چەشنە باس‌کردن و ناساندنێك هەبێ بـۆ کنایە بۆ (خوازە)ش ئەوەندە هەیە ، لە خوازەدا نیشانەیەکی تایبەتی هەیـە بۆ ئەوە کە گوزارە ئەسلیەکە مەبەست نەبێت ، وەکوو لـەم هـۆنراوەی سالمدا ئەمەمان بۆ دەردەکەوێ لە کاتێکدا کە دەڵێ :

شێر لە بێشە دەرپەڕێ غورش کونان نەعرە زەنان

دەست بە خەنجەر ، ڕوو بە ڕوو ئەیدا لە زوومرەی دوژمنان

وشەی (شێر) گوزارەیەکی ئەسڵی هەیە و یەکێکی خوازەی ئەسڵیـــە کە درِندەکەیە خوازەییەکە پیاوی ئازایە لێرەدا بێ خوازەییەکەیە ئەو نیشانە تایبەتیەش بۆ ئەوە کە خوازەیی‌یەکە بێ ئەوەیە کە دەڵێ (دەست بە خەنجەر، ڕوو بە ڕوو ئەیدا لە زومرەی دوژمنان ) دیارە دەستدانــە خەنجــەر لــە کردەوەی ئادەمیزادە نەوەك لە هی شێرێك کە جیایە لــە ئادەمیزاد .

ئەم نیشانە تایبەتیە وشەی (شێر) لە هۆنراوەکەدا کە باسەکەی ئێمەیە دەبــڕێ بەسەر زەلامەکەدا و دووری دەخاتەوە لە گوزارە ئەسڵیەکە »[٦] ئەوەی تۆزقاڵێك شارەزایی لە ڕەوانبێژیی عەرەبی‌دا هەبێت و لابەلاسەرنجی لە باسی میتەفۆری یۆنانی و ئەورووپیدا دابێت بە لایەوە جێی سەرسوڕمانە کە وشەی (شێر) لەم دێڕە هۆنراوەیەدا خوازەبێــت ، چونــکە پێوەنــدی نێوانی گوزارە (واتا) ئەسڵیەکەی (شێر) کە دڕوندەکەیە و واتا خوازەییەکەی کە ئادەمیزادێکی ئازایە لێکچوونە ، پەیوەندی لێکچوونیش ــ بێ گومان ــ بنــاغەی خواستنە و نیشانەی جیاکردنەوەیەتی لە خوازە کە پەیوەندیەکی لێکچوونی نیە .

نازانین مامۆستا سجادی بۆچی تووشی ئەم هەڵەیە بووە و ڕێــگای شوێن پێ‌هەڵگرتنی مامۆستاکانی ڕەوانبێژیی عەرەبی لە خۆی تێکداوە . لە کاتێکدا کە زۆر سوورە لەسەر بڕینی ئەم ڕێگایە و وە ویستوویەتی تەنانەت لایەنە ڕووکەشەکانی باسی مەجازیش لەبەر کتێبەکانی ئــەم مامۆستایانــە وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی ، وەکوو باسکردنی جۆرەکانی خوازەکە کە خۆی لێیان قوتار ناکات و دەڵێت : «هەروەها ئەبێ ئــەوەش بزانــین کــە (خوازە)ش دوو جۆرە یەکێکیان (ژیری ــ عقلی) یەکێکیان (زمانی ــ لغوی) ژیریەکە ئەوەیە کە نیسبەتی شتێك بدرێتە لای شتێکی تر کە ئەم ڕادەیە لــە

---

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩٢ــ٩٣ .

ڕاستیدا حەق نیە لەو بدرێ ، وەکوو دەڵی : (کۆشکێکم دروستکرد) ئەمە ڕاستە ئەو کەسە کە ئەمە دەڵێ بووە بە هۆ بۆ دروستکردنی ، بەڵام ئەسڵی دروستکردنەکە کرێکارەکان دروستیان کردووە •

جا ئەم جۆرە خوازەیە پێی دەووترێ خوازەی ژیری ، چونکە ژیریەکە ئەم فەرمانە دەدات • زمانیەکە کە لۆغەوییەکەیە • ئەوەیە کۆشکەکە لەکاتی دانانیا بۆ شتێکی تایبەتی دانراوە • وەکوو ئەوە لە کاتی مەتحکردنی پیاوێکا کە قسەی لێوە دەکرێ دەڵێ :(شێرێکم چاوپێکەوت) دیارە دەبێ پەیوەندی و نیشانە ــ قەرینە ــ یەك هەبێ لە بەینی گوزارە بۆ دانراوەکەدا و بەینی گوزارە خوازەییە کەدا • وە مەبەست لەم پەیوەندیەش پەیوەندیەکی حسیە لە بەینی هەردو گوزارەکەدا نەوەك پەیوەندیی ڕاستەقینە و جیابونەوەیە لە وێنەکەی ئێمەدا پەیوەندیەکی حسی هەیە لە بەینی ئەوپیاوە و شێرەکەدا کە زات بە جەرگی هەردوولایانە ــ نیشانەکەیشی باسکردنی پیاوێکی ئازایە و نەبوونی شێرێکی ڕاستەقینە لەو شوێنەدا ، وەیا دەووترێ (شێرێکم چاو پێکەوت لە حەمامدا) نیشانەکەی حەمامەکەیە چونکە شێری ڕاستەقینە ناچێتە حەمامەوە»[٧]• ئەم قسانەی مامۆستا سجادی بە بێ مشتومڕ لە ڕووی واتا و نموونەوە و ڕێبازی شیکردنەوەوە بیروڕاکانی کتێبە عەرەبیەکان بە جۆرێکی میکانیکی دووبارە دەکاتەوە ، بەڵگەشمان بۆ سەلماندنی ئەم میکانیکیە ئەوەیە مامۆستای ناوبراو لەسەر هەمان قسە دەڕوات و دەڵێت : «ئەمە و دیسان جیایی لە بەینی دوو شتەکەدا لێکچوون تشبیە مشابە ــ بوو ئەوە خواستنە ئەگەر غەیری لێکچوون بوو خوازەیە »[٨] •

ئەم ڕستەیە ئەوە دەردەخات کە مامۆستا سجادی جیاوازیی نێوانی (خوازە و خواستن)ی وشە بە وشە لە زمانی عەرەبیەوە وەرگێڕاوەتەوە

---

(٧) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩٤ •
(٨) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩٤ •

سەر زمانی کوردی بەلاَم چونکە لە دێرە هۆنراوەکەی سالمدا وشەی (شێر)ی بە خوازە لە قەلەم داوە دیارە ئاگای لەم جیاوازیە نەبووە و بە جۆرێکی میکانیکی تەنها خەریکی وەرگێران بووە •

زاراوەی خوازەش کە مامۆستا سجادی بەرامبەر بە هونەری مەجازی عەرەبی دایناوە وەرگێرانێکی وشەیی یە بۆ لێکدانەوەی چمکی وشەی مەجازی عەرەبی بە (نقل)و (منقول)و (مشتق)و (مأخوذ) •

کەوابوو باسی (خوازە) [٩] لە لای مامۆستا علاءالدین سجادی دا دەنگدانەوەیەکی باسە ڕەوانبێژیە عەرەبیەکانی سەردەمە دووا کەوتووەکانە و هیچ پەیوەندیەکی هونەری و زانستی بە سروشتی ئەم دیاردە زمانی و هونەریەوە لە زمانی کوردیدا نیە •

## مامۆستا عەزیز گەردی و باسی خوازە

مامۆستا عەزیز گەردی هەروەکو لە پێشەکیی کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا) باسدەکات ، ڕەنگە یەکەم نووسەری کوردبێت کە لێکۆلینەوەیەکی سەربەخۆی دەربارەی هونەری ڕەوانبێژیی گەلاَلە کردبێ • خوێنەری ئەم کتێبە لەسەر ئەم بناغەیەدا چاوەڕێ دەکات لێکۆلینەوەکەی بەرهەمی تازە و داهێنراو بێت و دووا بە دووای باسەکەی مامۆستا علاءالدین سجادی لە لێکدانەوەی خوازەدا هەنگاوێکی نوێی هەلگرتبێ ، بەلاَم مامۆستا عەزیز گەردی خۆی نایەوێ ئەو چاوەڕێیە زۆر بخایەنێ ، چونکە بە خوێنەرانی لێکۆلینەوەکەی ڕادەگەیەنێ و دەلێت : «بۆ سەرچاوەکان ناچار بووم هێز بدەمە سەرچاوەکانی عەرەبی ، خۆ ڕەوانبێژیش لە هەموو ئەدەبێکا واتە لە ئەدەبی هەموو میلەتێکا هەر یەکە ،

---

(٩) بڕوانە کتێبی (خۆشخوانی) مامۆستا علاءالدین سجادی چاپخانەی مەعاریف ١٩٧٨ کە لە باسی (خوازە)دا هەمان بڕیار دەیگێڕێتەوە .

ئەوەندەی هەیە زمانی نووسینەوە نموونەکان ئەگۆڕن و بەس ) [١٠] •

ئێمە ئامانەوێ ئەم بیانووەی مامۆستا عەزیز گەردی یەکالا بکەینەوە و بیسەلمێنین کە بڕیارێکی گشتییە بەلام دەپرسین ئەگەر هات و مامۆستای ناوبراو ناچار بوو بێت پەنا بەرێتە بەر سەرچاوە عەرەبیەکان ئەم سەرچاوانە بەرهەمی چ سەردەمێکی عەرەبین و لەسەر چ ڕێبازێك دانەرەکانیان باسی ڕەوانبێژیان کردووە ؟ •

مامۆستا عەزیز گەردی ڕاستەوخۆ وەلامی ئەم پرسیارە ناداتەوە ، بەلام کە لە زانستەکانی ڕەوانبێژی دەدوێ ، دەلێ : «ڕەوانبێژی کوردی هەروەکو ڕەوانبێژی هەر زمانێکی تر ئەکرێ بە سێ بەشەوە :ـ

ڕوونبێژی ـ البیان ـ واتاشناسی ـ المعانی ـ ، جوانکاری ـ البدیع ـ [١١] بێ گومان عەزیز گەردی هیچ نزیك نیە لە ڕاستیەوە کە دەلێ ڕەوانبێژیی هەر زمانێکی تر بەو جۆرە دابەش دەکرێ •

چونکە ئەم دابەش کردنە لە کتێبە ڕەسەنە هونەرییەکانی ڕەوانبێژیی عەرەبیدا نابینرێ و بۆ یەکەم جار بە چەشنێکی سەرەتایی لە کتێبی ( مفتاح العلوم) دانانی (السکاکی) کە سالی (شەش سەد و بیست و شەش )ی کۆچی مردووە بەرچاودەکەوێ •

کەوابوو مامۆستا عەزیز گەردی لەم کتێبەدا شوێنپێی مامۆستا سەردەمە دوواکەوتووەکانی ڕەوانبێژی عەرەبی هەلگرتووە و ئاگای لە کتێبە ڕەسەکانی ئەم ڕەوانبێژیە نیە و هیچ سەرنجێك لە کتێبە ڕەخنەسازیە عەرەبیە هاوچەرخەکانمانی نەداوە ، وەکوو کتێبەکانی (امین الخولی)وە (دکتور محمد مندور) و (احمد امین) و (فؤاد الشایب) •

---

(١٠) کتێبی ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا ل ٧ •
(١١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧ •

هەروەها بە هیچ جۆرێك پەیوەندیەکی زانستیانەی لەگەڵ ڕێبازە ڕەخنەسازیەکانی ئەم مامۆستایانە نەبەستووە .

دروستیی ئەم بڕیارەمان لە باسەکەی مامۆستای ناوبراودا دەربارەی خوازە بە تەواوی خۆی دەنوێنی و ئەو خوێنەرە کوردانە کە شارەزاییان لە مەجازی عەرەبیدا هەیە هیچ گومان لەوە ناکەن کە مامۆستای ناوبراو لە باسەکەیدا زیاتر لە وەرگێڕانی بابەتی مەجازی عەرەبی کۆن بەولاوە هیچ شتێکی تری نەکردووە . بۆ چەسپاندنی ئەم بڕیارەمان با بزانین مامۆستا عەزیز گەردی چۆن ئەم وەرگێڕانەی ئەنجام داوە و باسەکەی پێش کەش کردووە ؟ .

مامۆستا گەردی ناونیشانی باسەکەی بە زاراوەی (دروست‌وخوازە) وەردەگێڕی ئەم وەرگێڕانەش وەرگێڕانێکی وشە بە وشەی (الحقیقة والمجاز)ی عەرەبییە .

ئەمجا دەست دەکات بە وەرگێڕانی بابەتی (الحقیقة) لە کتێبە ڕەوانبێژییە عەرەبیەکانەوە کە لەسەر ڕێبازی مامۆستا دێرینەکانی عەرەبی دانراون و باسی بەشەکانی (الحقیقة) [١٢] دەکات واتە دروسیتی زمانی : (الحقیقة اللغویة) و دروستیی نەریتی (الحقیقة العرفیه) و دروستیی دەستوری ( الحقیقة الشرعیة ) .

کەم و کوڕی مامۆستا عەزیز گەردی لەم بەشەی کتێبەکەیدا تەنها لە وەرگێڕانی وشە بە وشەی باسەکەیدا خۆی نانوێنێت و بەس ، بگرە لە هەڵەیەکی لەمە گەورەتردا بەر چاو دەکەوێت ، ئەم هەڵەیەش ئەوەیە : مامۆستای ناوبراو ئاگای لەوە نیە کە ناونانی واتای نامەجازی ووشە لە ڕەوانبێژیی عەرەبیدا بە زاراوەی (الحقیقة) لە سۆزێکی ئاینییەوە

---

(١٢) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٥-٧٦ .

هەڵقوڵاوە و ئەو زانا عەرەبانە کە زاراوەی (الحقیقة) یان وەکوو دژوارێك بۆ زاراوەی (المجاز) داناوە ، ویستویانە بڵێین : مەجاز درۆیە و بەرامبەرەکەی واتە (الحقیقة) راستە ، بۆیە وشەکانی شرع وەکو : (الزکاة ـ الصلاة ـ الکفر ـ هتد...) بە (الحقیقة الشرعیة)یان ناوناوە .

جا ئەمە باری مامۆستا عەزیز گەردی بێت بێ گومان خوێنەر چاوەڕێی هیچ سەرەنجامێکی داهێنراو و بە کەڵکی لێناکات و بە تایبەتی کە سەرنج لە ناوەرۆکی باسەکەی دەدات کە بە پێناسەی خوازە دەست پێدەکات و دەڵێت : «خوازە بریتی‌یە لەوە کە ووشەیەك بۆ مانای دروستی خۆی بەکارنەبرێ بەڵکوو بۆ مانایەکی تر بخوازێ و مەبەستێکی تر بگەیەنێ ) :

احمد مختار بەگی جاف دەڵێ :

لە خەو هەستن مللەتی کورد خەو زەرەرتانە

هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزڵ و هونەرتانە

کە دەڵێ (لە خەو هەستن) بێ گومان خەو بۆ مانای دروستی نەهاتووە کە نووستنە ، بەڵکوو بۆ دەربڕینی مەبەستێکی تر بەکارهاتووە کە غەفڵەتی و بێ ئاگایی‌یە [١٣] .

ئەم دەقە هەروەکو دەزانین هیچ فڕی بەسەر لێکۆڵینەوەی هونەری ئاوەڵواتاوە نیە و پەیڕەوی‌کردنی کۆنترین بیروڕای ڕەوانبێژیی عەرەبییە لەم ڕووەوە و لە هێنانی شیعرەکەی احمد مختاری جاف بۆ مەشق و لێکدانەوەی پێناسە عەرەبیەکەی مەجاز بەولاوە شتێکی تری نەکردووە .

ئەگەر بەراووردی ئەم باسەی مامۆستا عەزیز گەردی دەربارەی

---

(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٨ .

خوازه لەگەڵ باسەکەی مامۆستا علاءالدین سجادیدا بکەین ، بە نیــازی ئەوەی بزانین کامیان لە شوێن پێهەڵگرتنی زاناکانی ڕەوانبێژیی عەرەبــی ووردترە ، دەبێ وەرگێڕانەکەی مامۆستا گەردی لە جۆرەکانــی خــوازە تۆماربکەین کە تێیدا دەڵێ : «خوازە بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆرە :

١ ــ خوازەی زمانی : ئەوەیە وشەیــەك لــە مــاناى ڕاستەقیــنەى دوور بخرێتەوە و بۆ ڕاگەیاندنی واتایەکی تر بەکاربهێنــرێ و پەیوەنــدیەکیش لە نێوانی مانای دروست و مانا خوازەییەکەدا هەبێت ئەوەش دوو جۆرە[١٤]:

أ ) خواستن : ئەو خوازەیەیە کە پەیوەندیەکەی لێكچوون بێت •

ب ) خوازەی بەرەڵلا : کە هەموو خوازەیەکی تری زمانی دەگرێتەوە کــە پەیوەندیەکەی (لیکچوون ــ مماثلة ــ نەبێ ، بۆیــە پێیدەووتــرێ خوازەی بەرەڵلا ، چونکە بە پەیوەندییەکەوە نەبەستراوە ، یا لەبــەر ئەوە کە پەیوەندیەکانی ئەکەونە نێوان مانــای دروســت و مانــای خوازەییی وشەکە ) [١٥] •

ئەم وەرگێڕانە هەروەکوو لە باسی مەجازی عەرەبیدا بۆمان دەرکەوت بە ئەوپەڕی ووردیەوە خۆی بە نەخشەی زاناکانی ڕەوانبێژیی عەرەبیــەوە بەستووە و خواستن و خوازەی بەرەڵلا لە ژێر ناونیشانی خوازەدا بــاسی دەکات و جیاوازیی نێوانیان دەردەخات کەچی مامۆستا علاءالدین سجادی هەروەکوو ووتمان لەو نەخشەیە لای داوە و بــە ئاڵــۆزاوی چەشنــەکانی مەجازی باسکردووە •

بەڵام ئایە ئەم ووردیەی مامۆستا عەزیــز گەردی هیچ نرخێــك بــە باسەکەی دەدات و بە لێکۆڵینەوەیەکی تازە و سوودبەخش دەیخاتە بەرچاو؟

---

(١٤) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٨ •
(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧٠ •

ئێمە لەو باوەڕەدا نین و هەموو نرخی ئیشەکەی ئەم مامۆستا بەرێـزە ئەوەیە توانیویەتی بە زمانێکی رەوان و هێنانی نموونە لە وێژەی کوردیەوە زۆربەی بابەتەکانی زانستی بەیانی عەرەبی وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی•

## دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف و لێکۆڵینەوەی مەجازی

باسی مەجاز بە سەر زانستی ڕەوانبێـژیدا دانـەبڕاوە و بابەتێـکی هونەری ڕووت نیـە ، بەڵکوو لـەگەڵ لێکۆڵینـەوەی زمـانی و بـاسی فیلۆلۆجیشدا تێکەڵاوە و زمانەوانەکانیش بە زۆری و بە کەمی خەریـکی دەبن •

دیارە ئەم ڕاستیە بووە کە قەڵەمی (دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف)ی ڕاکێشاوە بۆ ئەم کۆڕە وەکوو پسپۆڕێك لە زانستی زمانقدا چەند لاپەڕەیەك لە کتێبەکەی (ووشەی زمانی کوردی) بۆ لێکۆڵینەوەی واتای مەجـازی تەرخان بکا •

جا با بزانین بەرهەمی ئەم چەند لاپەڕەیە چیە و ئەگەر مامۆستا سجادی و مامۆستا عەزیز گەردی لەبەر ناپسپۆڕیان نەیانتوانی لـەم باسەدا شتێـکی گرنگ پێشکەش بکەن ئایا دکتۆر و پسپۆڕی ناوبراو توانیویەتی کەلێنك لە لێکۆڵینەوەی زمانی پڕ بکاتەوە ؟

دکتۆر ئەوڕەحمـان لەبـابەتی (واتانـاسی) Semaslology دا لە مەسەلەی واتای ووشە دەکۆڵێتەوە و دەڵێ : «لە زمانی کوردیشـدا وەکوو هەموو زمانەکانی تر ووشە هەن کە تەنیا یەك مانایان هەیە وشـەش هەن کە مانایان زۆرە ، بۆ نموونە دەبینین کە هەندێ وشە وەك (شـەو ، ئاشەوان ، دراوسێ ، ئەژنۆ ••• هتد » لە یەك مانا زیاتریان نیە ، بـەڵام ووشەش هەن مانایان زۆرە و ئەو مانایەش لە یەك نزیکن وەك :

بەردانەوە :

١ـ بەردانی ئاوی گیراو ٠
٢ـ فڕێدانی شتێك لە بەرزیەوە ٠

جۆش‌سەندن :

١ـ هاتنە کوڵی شتی شل لەسەر ئاگر ٠
٢ـ بریتیە لە تاوسەندنی جیهان لە هاویندا ٠
٣ـ گەرم بوونی یەکیك لەکارێکدا ٠

پـووچ :

١ـ شتی بێ ناوکی کلۆر ٠
٢ـ بریتیە لە قسە و گفتوگۆی بێ‌هۆدە ٠ (١٦) ٠

ووردبونەوە لەم دەقە ئەوە دەسەلمێنێ کە دکتـۆر ئەوڕەحمـان لـەم بابەتەدا جگە لە ڕوونووسـکردنی ڕووداوە زمانیـەکە و هێنـانی چەنـد ووشەیەك و وەرگرتن و ڕاڤەکردنی نموونـەکانی لە چەنـد فەرهەنگێـکی کوردیەوە بە تایبەتی فەرهەنگی خاڵ ، هیچ شتێکی تری نەکردووە ٠ نازانین بۆچی لە زۆری مانای هەندێ ووشەی کوردی لەسەر بناغەی مەجـاز کـە ڕێگای پەرەسەندنی واتای ئەو ووشانەیە نەکۆڵیوەتەوە و بە هیچ کلۆجێك لە پەیوەندیی نێوانی دوو واتاکەی ووشەی (بەردانەوە) و (پوچ) و سـێ واتاکەی (جۆش‌سەندن) نزیك نەبۆتەوە و چۆنیەتی گۆڕانـی ووشـەکان لەواتاکەیەوە بۆ واتایەکی تر شی‌نەکردۆتەوە ؟ ئەمە پرسیارێکە ـ بێ‌گومان ـ وەڵامەکەی لە گەڵیایەتی و بە ئاشکرا دەڵێ : دکتۆر ئەوڕەحمان لەم بابەتـە زمانیەدا شوێن‌پێی ڕێبازی وەصفی کە کۆنترین ڕێبازی زمانەوانە عەرەبەکانە،

---

(١٦) بڕوانە کتێبی وشەی زمانی کوردی ل ٩ـ١٠ .

هەڵگرتووە و وەکوو دانەرە فەرهەنگیە دێرینەکان واتا جۆر بە جۆرەکانی چەند ووشەیەکی تۆمارکردوە و هەر بۆ ڕووکەش لە تەك سەردێڕە کوردی‌یەکەی (واتاناسی) زاراوەی Semaslology نووسیوەتەوە بە بێ ئەوەی پێویستیەکانی سەرشانی زانا کانی زانستی ئەم زاراوەیە بەدی بهێنێ •

هەرچۆنێك بێت با ئەوەش بزانین کە دکتۆر ئەوڕەحمان دوا بە دووای ڕیزکردنی واتاکانی ئەو ووشانە لە کوتایی باسەکەیدا ووتویەتی :

«فرەواتایی بەشێکی زۆری ووشەکانی زمانی کوردی ئەوە نیشان‌دەدات کە بەم زمانە دەتوانرێ باش تەعبیر بکرێ ، هەروەها شایانی باسە زۆربەی ئەو ووشانە بە ڕەسەن کوردین و لە ناوجەرگەی کوردەواریدا هەڵقولاون » (١٧) •

ئەم ووتەیە تۆزقاڵێك لە بنەڕەتی باسەکە نادوێت و ئەوە دەردەخات کە نووسەر لە تەنگوچەڵەمەی زۆری واتای ووشە دوورکەوتۆتەوە و نەی‌ویستووە ڕوونی کاتەوە کە ووشە ئەگەر هات‌و سادە بوو وەکوو ووشەی پووچ خۆی لە خۆیدا لە یەك واتا زیاتری نیە و واتاکانی تری بە هۆی ڕستەوە دەست نیشان دەکرێن و لەسەر بناغەی مەجازدا ئەو واتایانە شی‌دەکرێنەوە و هەروەها نەچووە بە لای ئەوەی کە ووشەی لێکدراو وەکوو ووشەی (جۆش‌سەندن) لەکاتی زۆری واتاکانیدا دەبێ چۆنیەتی لەدایك‌بوونی باس‌بکرێت و لە سەرچاوەکانی بکۆڵرێتەوە و پەیوەندی نێوانی واتاکانی وەکوو ووشەیەکی لێکدراو لە لایەکەوە و واتای هەر ووشەیەکی سادە لە قەوارەکەیدا لە لایەکی‌ترەوە دەست‌نیشان بکرێت •

بۆ دکتۆر ئەوڕەحمان هەیە کە بڵێ : من ئەمانەم هەمووزانیوە ، بەڵام

---

(١٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٠ •

لەبەر چەند هۆیەك زانینەکەم بەکارنەهێناوە ئێمەش دەبێ باوەڕمان بە نووسەری هاوڕێمان هەبێت ، بەڵام لە هەمان کاتدا با بزانین دکتۆر ئەورەحمان سەردێڕی (جۆری مانا)ی پاش ئەو ووتەیە چەقاندووە و دووبارە لە زۆریی واتای وشەی کۆڵیوەتەوە و ئەم جارە ڕاستەوخۆ خۆی گەیاندۆتە باسی (الحقیقة والمجاز) لە ڕەوانبێژیی عەرەبیدا و هەنگاو بە هەنگاو ئەوەی پەیوەندی بە زۆریی واتای وشەوە بێت لەم باسەوە بە بێ ووردبونەوە وەری گێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی •

دکتۆر ئەورەحمان لە سەرەتای سەردێڕی (جۆری مانا)دا دەڵێ :
«لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ دوو جۆر مانای ووشەیی جیابکرێتەوە : ــ

١ــ مانای حەقیقی Divect (pvopev) meuning بەو مانایە دەوترێ کە ڕاستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقعی نیشان دەدات •

٢ــ مانای مەجازی Transfered meaning بەو مانایە دەوترێ کە ڕاستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقعی نیشان نادات ، بەڵکو لە ڕێگای پەیوەندیەوە لەگەڵ دیاردەیەکدا مانادەدات»[١٨] ئاشکرایە کە دکتۆر ئەورەحمان لەم تێکستەدا لە سەرچاوەیەکی عەرەبی سەردەمە دوا کەوتووەکانەوە زاراوە و پێناسەی مانای حەقیقی و مانای مەجازی ووشەی وەرگرتووە ، ئەم وەرگرتنەش هەروەکوو لە تێبینییەکانمان دەربارەی مامۆستا علاءالدین سجادی و مامۆستا عەزیز گەردیدا بینیمان بۆ یەکەم جار لە زمانی کوردیدا ڕووی نەداوە ، بەڵام جێگای داخ ئەوەیە مامۆستایەکی پسپۆڕ دووبارەی دەکاتەوە و خۆی لە هۆ ئایینیە دێرینەکەی ناپارێزێ کە لە زانستی ڕەوانبێژیی عەرەبی کۆندا زاراوەی (الحقیقة) بەسەر واتای ووشەدا دابڕاوە• بەڕاستی جێگای سەرسوڕمان لەم ڕووەوە ئەوەیە کە دکتۆر ئەورەحمان

---

(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٠ــ١١ •

زاراوه جیهانیه‌که‌ی (الحقیقة)ی عه‌ره‌بی Divect (pvect) medning
ڕوونوس‌کردووه ، که‌چی خۆی له واتای ئه‌م زاراوه‌یه که به عه‌ره‌بی (المعنی المباشر)ه لا ده‌دات و له پێناسه کوردی‌یه‌که‌یدا ووشه‌ی مه‌وزووعی و واقعی به‌کارده‌هێنێ و به بێ ئه‌وه‌ی ئاگای له خۆی بێت ڕای ده‌گه‌یه‌نی که وه‌کوو هه‌ندێ له زانا ئاینیه موسڵمانه کۆنه‌کان له‌و بڕوایه‌دایه که واتای مه‌جازی درۆیه و ڕاست نیه • جگه له‌مه‌ش پێناسه‌ی مه‌جاز وه‌کوو پێناسه‌ی حه‌قیقه‌ت لای دکتۆر ئه‌وڕه‌حمان‌دا به جۆرێکی ڕوکه‌شانه‌ی وا وه‌رگێڕاوه که ده‌رفه‌تی ئه‌وه‌ی نه‌داوه نموونه ووشه‌یی‌یه‌که‌ی له‌به‌ر تیشکی ڕێبازی یه‌کالا کردنه‌وه‌دا شی‌بکاته‌وه ، به‌ڵکو ئه‌وه‌ی پێی‌کراوه هه‌ر ئه‌وه‌یه که ووتویه‌تی : «به وێنه‌ی ووشه‌ی ئاگرنانه‌وه» له زمانی کوردیدا به مانای (ئاگربه‌ردانه به‌شوێنێکه‌وه که بسووتێ) و (هه‌ڵگیرساندنی شه‌ڕ و ئاشووبه‌نانه‌وه) دێت • مانای یه‌که‌می ئه‌م وشه‌یه (ئاگربه‌ردانه به شوێنێکه‌وه که بسووتێ) که مانایه‌کی حه‌قیقی‌یه ئاشکرا و دیاره که ڕاسته‌وخۆ دیارده‌یه‌کی مه‌وزووعی واقعی نیشان ئادات ، چونکه ئاشکرا و دیاره که له‌م ڕووداوه‌یاندا (گڕگرتن و سووتاندن)ی تێدا نیه ، به‌ڵکو ئه‌م کاره (ناخۆشی و وێرانی و خراپی) له دووایه ، له ئه‌نجامی (گڕگرتن و سووتاندن)ه‌وه نزیکه ، به‌م جۆره له ڕێگای نزیکی و وێکچوونه‌وه په‌یوه‌ندی ئه‌و دوو ڕوداوه ، ووشه‌ی (ئاگرنانه‌وه) به‌و دوو مانایه ، واته حه‌قیقی و مه‌جازی هاتووه [١٩]
خوێنه‌ره‌کانمان له به‌ر ده‌ستی ئه‌م ده‌قه‌ی دکتۆر ئه‌وڕه‌حمان ته‌نانه‌ت پرسیار نه تازه و داهێنانی ئه‌م قسانه ناکه‌ن ، چونکه به‌رهه‌می هه‌مان ڕێبازه له لاسایی‌که‌ره‌وه‌که‌ی مامۆستا علاءالدین سجادی و عه‌زیز گه‌ردی‌یه ، به‌لام دووباره وه‌کوو ئێمه به داخه‌وه‌ن که ئه‌م مامۆستا پسپۆڕه نه‌یتوانی‌وه خۆی له هه‌ڵه‌ی تێکه‌ڵ کردنی مه‌جازی عه‌ره‌بی له‌گه‌ڵ ئیستعاره‌ی عه‌ره‌بی

---

(١٩) هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل ١١ •

بپارێزێ و بە جۆرێکی زانستیانە لە مەسەلەی پەیوەندیەکانی نێوانی دوو واتاکەی وشەی مەجازی بکۆلیتەوە ، سەرەڕای ئەمەش ئێمــە لە دکتــۆر ئەورەحمان ناگەین کە دەڵێ :

هەرچی مانای مەجازیە لە زمانی کوردیدا پەیــدا دەبێ لە ئەنجــامی (نزیکی و وێکچوونی) ووشەی (وێکچوونی) (التشابە)ی عەرەبیە ، بەڵام مەبەستی (لە نزیکی) ئەبێ چی بێت ؟ ..

لە هەندێ کتێبی عەرەبیدا ووشەی (التقارب) و (المناسبــة) کە بــۆ دەستنیشانکردنی پەیوەندیی بە واتــای حەقیقی بە واتــای مەجازی‌یــەوە بەکارهێنراون ، بەڵام تێکەڵکردنیان لەگەڵ (المتشابــە والمشابــە) هەرگیز ڕووی‌نەداوە ، بەم جۆرە ڕەنگە بۆمان هەبێت کە بڵێین : باسی مەجاز لــە لای دکتۆر ئەورەحمان هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە نیە ئەگەر بێت و لەگەڵ هەنگاوەکانی مامۆستا علاءالدین سجادی و عەزیــز گەردیــدا بەراووردی بکەیــن .

# ئێمــەو ئــاوەڵواتا

لە پێشەکی ئەم کتێبەماندا سەرنجی خوێنەرانمان بۆ سەرئەنجامێــك ڕاکێشا کە ویستمان بە هۆیەوە گومانێك لە دڵیاندا دەربــارەی دروســتی زاراوەی خوازە و وەکوو دوو نــاو بۆ ڕوداوێــکی زمــانی و هونــەری بەرپابکەین و ووتمان : بە لای ئێمەوە لە بری ئــەم دوو زاراوەیــە زاراوەی ئاوەڵواتا باشتر دەستدەدات و بۆ ڕوونکردنەوەی ئــەو روداوە زمــانی و هونەری‌یە پڕ پێستی خۆیەتی :

# سیمانتیك و ئـاوەڵواتا

بێ گومان ئێمە لەم بیرو ڕایانەماندا نامانەوێ ئەوەی بەر لە ئێمە لـە زانستی زمان و ڕەخنەسازیی کوردیدا بنیادنراوە تێکیبدەیـن ، بەڵـکوو بەهۆی پسپۆڕیمانەوە لە ڕەخنەسازی و ڕەوانبێژی بە گشتی و ڕێـازەکانی شیکردنەوەی مەجازی قورئانی پیرۆز کە لە سەرچاوەی یۆنانی و عەرەبی و ئەورووپی دێرین و هاوچەرخەوە هەڵقوڵاوە بە تایبەتی بڕوامان بەوە هێناوە کە سامانە کۆنەکەی باسکردنی میتەفۆر و مەجاز و خـوازە بـە هـۆی پەیدابوونی چەند زانستێکی تازەوە وەکوو شوێنەوارێکی پاشماوە تەماشا دەکرێت و شوێنە ڕاستەقینەکەی ئەتیکەخانەیە نەك لە کتێبی هاوسەردەمدا بە با بکرێ •

لەو زانستانە : زانستی (سیماتیك)ە کە لە واتای ووشە و دەربڕیـن دەکوڵێتەوە و چالاکی و بلیمـەتی چەندەها تاقـم لە فەیلەسووفـەکان و زمانەوانـەکان و زانـاکانی دەروون و ئەنثروبۆلۆجیـا و وێـژەرەکان و هونەرمەندەکان و شارەزاکانی ئابووری و سروشت [1] لەبەر هۆی جۆر بە جۆر دەهێنێتەکار •

هەڵبەت (سیماتیك) بەم هەموو توانایەوە دەتوانێ بابەتی ئاوەڵواتـا لەسەر بناغەیەکی زانستی و هونەری ڕوون بکاتەوە و سروشتی ئەم ڕووداوە زمانییە بخاتە بەرچاو و ئەرکی سەرشانی لە زمان و وێژەدا دەستنیشان بکات • لەگەڵ ئەمەشدا وە نەبێ ئێمە بە تەنیا پشت بەم زانستە ببەستین و دووپاتیکەینەوە کە هیچ شتێکی دیکە بە تایبەتی ڕێبازی هەمە ڕەنـگەی ڕەخنەسازیی هاوچەرخ و تایبەتیەکانی زمانی کوردی گرنگیاننیە ، چونکە ئاوەڵواتا خۆی لە خۆیدا ڕووداوێکی سـادە و سـاکار نیـە ، بەڵـکوو

سەرئەنجامێکی لێکدراوە پەیوەندیی بە هۆشمەندی و سۆز و ئەندێشەی ئادەمیزاد و نەریتی کۆمەلایەتی و سامانی دێرینی نەتەوایەتیەوە هەیە ...

## مەلبەنــدی ووشــە

یەکێك لە هەرە جیاوازی‌یەکانی نێوانی ئێمە و ئەوانــەی کە بــاسی میتەفۆر و خوازە و مەجازیان تا ئێستا کردووە چۆنیەتی تەماشاکردنی وشەیە: ئەوانەی بەر لە ئێمە ووشەیان وەکوو دەربڕینێکی بێ ڕەگ‌وڕیشە و دەنگێکی زمانی تاقانە و لە ڕستە پچڕاو و نیشانەیەکی لە توێ فەرهەنگ و قســەی بەرگوێ کەوتوو لێکداوەتەوە، بەلام ئێمە نامانەوێ بیروباوەڕمان دەربارەی ئەم هەلەیە زیندەبەچال بکەین ، بۆیە پێش هەمــوو شتــێك دەپرســین : مەلبەندی ووشە دەبێ چی بێت ؟ زمــان کە ئەنجــامی دەدا سەرچــاوەکەی چی‌یە ؟ چۆن لە گوێ کاردەکــات و بۆچی دەبــێ وەکــوو گیاندارێــك تەماشابکرێ ؟ زاناکانی فیسیۆلۆجی و دەروون و زمان لەو بڕوایەدان کــە ئاخاوتن (خیوێك) [٢] نی‌یە بەسەر زمانی دوێنەرەوە بێت و ئەمجا ئاوابێت، بەلکو شوێنەوارێکە لە هێزەکانی هۆشمەندی‌یەوە لە دایك دەبێت . زانای بەناوبانگ (برۆکا) لەم رووەوە تیوریەکی هەیە دەلێت : مەلبەندی ئاخاوتن لە توێ سێ‌یەمی مێشك‌دایە لە لای چەپیەوەیە [٣] ، مێشکیش پارچەیــەکی زیندووە ڕووداوەکانی هۆشمەندی بە هۆیەوە ئەنجام دەدرێــن ، بــەلام هۆشمەندی هەروەکوو زاناکانی دەروون دووپاتی دەکەنەوە کۆمەلێکە لــە توانا و هێزەکانی ئادەمیزاد و پارچەیەکی هەست‌پێ‌کراو لە مێشك نی‌یە ... ئەوەی لە توانا و هێزی هۆشمەندی پەیوەندیی بە باسەکەمانەوە هەبێت دوو چالاکی‌یە :

---

(١) بڕوانە کتێبی (مناهج البحث فی اللغة ل ٢٤ .

(٢) خێو : الشبح .

(٣) بڕوانە کتێبی (کتاب اللغة) ل ٣٧ـ٣٨ .

یەکەم : تۆمارکردنی ئەو وێنانەیە کە بە ڕێگای یەکێک یان پتر لە پێنج هەستپێکەرەکانی ئادەمیزادەوە لە جیهانی دەرەوە بۆ مێشک دەگوێزرێنەوە •

ئەم وێنانە لە ناو مێشکدا لە پەیدابوونی ڕواڵەتی شت لەسەر ئاوێنە دەچن ، بەڵام دەبێ بزانین وێنە لە ئاوێنەدا بە لاچوونی قەوارەکەی ئاوا دەبێت ، کەچی وێنەکانی هۆشمەندی لە ناو مێشکدا تۆمار دەبن و ڕەگ و ڕیشە دادەکوتن و دەچەسپێن و بە لاچوونی قەوارەکانیان لاناچن •

دووەم : هێنانەوەی وێنە تۆمارکراوەکان :

ئەو وێنانەی کە لە ناو مێشکدا تۆمارکراون ئەگەر هات و هەسپێکەرەکانی ئادەمیزاد تووشیان بوو بە توشی شتەکانیانەوە یاخود ئەوەی پەیوەندەی‌یەکی بە شتەکانیانەوە هەیە یاد دەکرێنەوە و دەهێنرێنەوە بەرچاو زەین و ئەندێشە [٤] •

نیشانەی زمانی [٥] وێنەیەکی هۆشمەندی‌یە دوو ڕووی هەیە :

یەکەم : هێنانەوە یادی ئەو وشەیەیە کە بوێ دانراوە •

دووەم : یادکرنەوەی ئەو شتەیە کە بوێ دانراوە •

بۆ نموونە هەموو کەسێك دەتوانێ ناوی ئەو وێنە هۆشمەندی‌یە کە دەربارەی (بەرد) لە مێشکی‌دا تۆمار بووە یاد بکاتەوە و ووشەکەی بهێنێتە فکری ، هەروەها دەتوانێ ڕواڵەتی بەردیش بهێنێتە بەرچاو و زەینی خۆی ، بەم پێیە ئادەمیزاد کە نیشانەی زمانیی بە دەست دەهێنی ئەگەر هات و گوێی لەو ووشەیە بوو کە بۆ شتەکەی دانراوە یەکسەر ئەو شتە یاد دەکاتەوە ، هەروەها ئەگەر هات و چاوی بەو شتە کەوت ووشەکە

---

(٤) بڕوانە کتێبی (محاضرات فی اللغة) ل ٢٨–٢٩ .
(٥) نیشانەی زمانی : الرمز اللغوی .

دەهێنێتەوە فکری خۆی • چالاکی هێنانەوە یادی ووشـــە و نـــاونراوەکەی یارمەتی ئەندامانی کۆمەڵ دەدا بۆ لە یەکترگەیشتن ، چونـــکە ئەندامـــانی کۆمەڵ هەموویان لە هۆشمەندی یەکانیاندا هەمان وشەیـــان بۆ هەمـــان شتیان تۆمارکردووە و واتاکانیان لە یادیاندا چەسپاون • لەبەر ئەمـــە کـــە وشەیەك یان ڕستەیەك لە دەمی قسەکەر دێتە دەرەوە یەکسەر لە هۆشمەندی گوێگرەوە واتای ئەو وشەیە دێتەوە یاد و پەیوەندیەك لە نێوانیاندا پەیدا دەبێت ، ئەم پەیوەندی‌یەش لە یەك گەیشتنە •••

## زاراوەی ئاوەڵواتا بۆ چی ؟

ئەو سەرئەنجامانەی کە بەرهەمی زانستی بیۆلـــۆجی و دەروونـــی و کۆمەڵایەتی و زمانین ڕاستن و هیچ گومانیان لێ ناکرێ ، بەڵام دەبێ بزانین هەردوو چالاکی : وێنە تۆمـــارکردن و وێنەهێنـــانەوە یـــاد دوو ڕووداوی میکانیکی نین ، چونکە لە سەر شانۆی هۆشمەندی ئادەمیزاددا ڕوودەدەن ئادەمیزادیش پارچەیەك لە ئاسن نیە ئەگەر هات و لێی‌درا دەنگ‌بداتەوە و بەس ، بەڵکو گیان‌لەبەرێکی زەین‌دار و خاوەن ئەندێشە و هۆشیاری‌یە : کارتێ‌کردن وەردەگرێت و ئەمجا بەسەربەستی‌یەکەوە دەستی تێ‌دەخـــات • بۆیە کە گوێی لە ووشەیەك دەبێت واتاکەی بە ڕووتی یاد ناکاتەوە ، بـــگرە دەرگای هەموو یادگارەکانی دەربارەی ئەو وشەیە لە مێشکیدا دەکاتەوە و گشت واتاکانی دەهێنێتەوە یاد و پاش بەراوردێکی خێرا مێشـــکی ئـــەو واتایە هەڵدەبژێرێ کە ووشەکە لە ڕستەکەی‌دا بۆی بە کارهاتووە •

ئەمە لە لای گوێگر و خوێنەرەوە لە لای قسەکەر و نووسەریشەوە هەمان ڕووداو ئەنجام‌دەدرێ • هەر ووشەیەك لە هۆشمەنـــدیدا ژیـــانێکی تایبەتی چەسپاندووە و شریتێك لە یادگاری تۆمـــارکردووە ، کە دەیـــەوێ بیروڕای خۆی بەو ووشەیە دەرببڕێ بە گوێرەی پێویست واتـــای ئـــەو

ووشەیە لە ڕستەیەکدا دەستنیشاندەکات و مەبەستی خـۆی دەگەیێنێتـە گوێگر و خوێنەر • لەبەر تیشکی ئەم بناغەیەدا دەبێ دوو بـارە بزانـین واتاکانی ئەو ووشەیـە لە کۆمەڵـەوە دەستکەوتـوون و لـە دووتـوێ وشەکەیاندا پێکەوە چەسپێنراون و هەنگاو بە هەنگاو لە دەوروبـەریدا کۆبوونەتەوە •

جا لێرەدا نابێ فەرامۆشی مێژوی چەسپاندن و کۆبوونەوەی واتاکان لە ووشەکەیاندا بکەین ، چونکە ئەم واتایانە هەموو بە یەك قۆنـاغ بـۆ ووشەیەك خڕ نەکراونەتەوە و ووشەکەش لە یەك قۆناغدا کۆمەڵ بۆ گشت واتاکانی دای نەناوە ، بەڵکوو هەنگاو بە هەنگاو ژیانی ووشـە پـەرەی سەندووە و بە گوێرەی پێویست بۆ واتایەکی تر بەکارهاتووە •

نموونەیەك کە ڕەنگە ئەم بوونەی ووشە ڕوونبکاتەوە و قۆناغەکانی ژیانی دەستنیشانبکا ووشەی (شێر)ە ئەم وشەیە لە هۆشمەندی ئێمـەدا یەکەم جار بەسەر دڕندەیەکی تایبەتیدا دابڕاوە لە پاشدا دەرکەوتووە ئـەم دڕندەیە لەدڕندەکانی دی ئازاترە ، بۆیە ووشەی (شێر) واتای ئازایەتیشی پەیداکرد و کردی بە ئاوەڵ بۆ واتا پێشوەکەی •

بەم جۆرە ووشەی (شێر) خوێ لە خوێدا دوو واتای هەیە :

یەکەم : ناوێکە بۆ دڕندەیەك کە یەکەم جار پەیدا بووە •

دووەم : ئاوەڵناوێکە بۆ دڕندەیەك کە دووایی پەیدا بووە •

ئێمە کە بەم جۆرە دەڕوانینە لەدایكبوونی واتـاکانی ووشـە و بـە زاراوەی خوازە و خواسـتن و درکـە و مەجـاز بێ دەستنیشـانکردنی قۆناغەکانی ووشە قایل نەبووین ، چونکە ئەم زاراوانە بەڕووکەشی واتاکانی ووشەیەك دەستنیشان دەکەن و لێمان دەگەیەنن کە ئەگەر هات و وشەیەك

دوو واتا یان زیاتری هەبوو لە واتاکەیەوە قەرز کراوە یان خوازراوە یان هەڵگیراوە بۆ واتایەکی تر •

کەچی بابەتەکە بە هیچ جۆرێك وا نییە ، ووشە چ تاقانە بێت چ دەربڕینێك بێت خۆی لە خوێدا لە هۆشمەندیی ئەوانەی کە پێی دەدوێن دەشێ تاقە واتایەکی هەبێ و دەشێ خاوەن چەندەها واتا بێت • ئەگەر لە واتایەك زیاتری هەبێت دەبێ بزانین لە سەرەتای پەیدابوونیدا بۆ یەك واتا بە کارهاتووە ، ئەمجا بە هۆی بە کارهێنانیەوە و بە گوێرەی پێویستی بۆ واتایەك یان زیاتر بە کارهاتووە • ئێمە بە واتای یەکەمی ووشە دەڵێین واتای (زمانی) چونکە پێویستی زمان ئەو واتایەی بۆ ووشە خوڵقاندووە ، بەلاّم واتاکانی تری بە زاراوەی (ئاوەڵواتا) ناو دەبەین ، لەبەر ئەوەی ئەم واتایانە دووای واتا زمانییەکە پەیدابوون و لە ژیانی ئەو ووشەیەدا هەنگاو بە هەنگاو قۆناغ بە قۆناغ لەدایكبوون و بوون بە ئاوەڵ و هاورێی واتا زمانییەکەی ووشەکە • بەم پەیڕەوە دەتوانین ووشەی (شێر) لە ڕستەی (شێر لە جەنگەڵدا دەژی) شیبکەینەوە و بڵێین : واتای زمانی ئەم ووشەیە درندەکەیە ، بەلاّم لە ڕستەی (شێرەکەمان لە شەڕدا سەرکەوت) بۆمان هەیە بڵێین ئاوەڵواتای ئەم ووشەیە پیاوێکی ئازایە •

بەم جۆرە رزگارمان لە زاراوەی خوازە و خواستن و درکە و مەجاز و حەقیقەت و مەوزوعی و ••• هتد ••• ئەبێت و ڕێبازێکی نوێ بۆ شیکردنەوەی ئەم هونەرە بەرزە بەرپادەکەین •

## چەشنەکانی ئاوەڵواتا

ئەوانەی بەر لە ئێمە لە کوڕی زانستی ڕوونبێژیی عەرەبیدا باسی چەشنەکانی ئەو ووشە و دەربڕینانەیان کردووە کە لە ڕەسەندا ئاوەڵواتان لە سێ بابەتی لقیدا باسەکەیان پارچە پارچە کردووە :

یەکەم : بابەتی خوازە (مەجاز) کە لە لایان بریتی‌یە لە ووشەیەك یان دەربڕینێك بۆ مانای دروستی خۆی بە کارنەهێنراوە ، بەڵکوو بۆ مانایەکی تر خوازراوە و مەبەستێکی دیکە دەگەیەنێ بە مەرجێك لە نێوانی هەردوو ماناکەدا پەیوەندی‌یەك بەدی‌بکرێ ئەم پەیوەندی‌یەش لە خوازەدا جۆربەجۆر و بەرەڵلایە ، وەکوو ئەم دێڕە هۆنراوەیە کە دەڵێ •

میوەی گەیشتووی زەردوسووری باخ

جریوەی جووکەی دارستانی شاخ

مەبەستی خاوەنی ئەم دێڕە لە دەربڕینی (جریوە و جووکەی دارستان) جریوە جریوی ئەو مەل و باڵندانەیە کە لە ناو دارستانەکە دەنگیان تێکەڵ بووە و ئاوازێکی دڵفرێنیان دروست‌کردووە ، و لێرەدا ناوی شوێنەکەی لێخواستووە کە (دارستان)ە بۆ ئەو شتانەی لەوێ‌دان کە باڵندەن • واتە پەیوەندیی نێوانی هەردوو مانای دەربڕینی جریوە و جووکەی دارستان پەیوەندیی شوێنی‌یە (المحلية) [1] •

دووەم : بابەتی خواستن (الاستعارة) •

کە بریتی‌یە لە بەکارهێنانی ووشەیەك بۆ دەربڕینی مانایەکی تر بێجگە لە مانای دروستی ووشەکە بە مەرجێ پەیوەندیی نێوانی مانای دروست و مانای خوازەیی ووشەکە وێچوون بێت ، دەبێ نیشانەیەکیش هەبێ کە ئێمە مەبەستمان بەم ووشەیە مانا خواستراوەکەیە نەك مانا دروستەکە •

ئەدەب دەڵێ :

گەه لە باخی سینەدا سەیری دوو نارنجم دەکرد

گەه لە گوڵزاری جەماڵی تەماشای یاسەمین

---

(۱) بڕوانە کتێبی ڕەوان بێژی لە ئەدەبی کوردیدا ل ۸ •

(نارنج) مانا دروستەکەی ناگەیەنێ کە بەری دارێکە ، بەڵکوو بـۆ شتێکی تر خواستراوە کە (مەمك)ە پەیوەندیـش لە ێـوانی (نـارنج) و (مەمك) وێكچوونە ، کە مەمك زۆر بە نارنج دەچێ [2] .

سێهەم : بابەتی درکە (الكناية) کە ئەوەیە ڕاستەوڕاست ناوی شتێك نەبەی ، بەڵکوو بچی ناوی شتێکی تر ببەی کە پەیوەندی بە مانای یەکەمەوە هەبێت بۆ ئەوەی پیاو لەو مانا باسکراوە بۆ مانا مەبەستە هێمـابۆکراوەکە بچێ ، ئەو پەیوەندیەش پەیوەست و پەیوەسـتراوە : (لازم و ملـزوم) . وەکوو دەربڕینی (لە گوێی گانووسـتوون) کە درکەیـە لـە غەفڵـەتی و بێئاگایی : لە گوێی گانووستن پەیوەستە ، بێئاگاییش پەیوەستراوە [3] ..

ئەگەر خوێنـەر بـە ووردی لە پێنـاسە و نموونەکانی ئەو سێ بابەتە لقییە بکۆڵێتەوە دەگاتە ڕاستیەکی زانستیانە ئەم ڕاستیەش ئەوەیە : تاقە جیاوازیی ێوانی خوازە و خواستن و درکە جۆر بە جۆریی پەیوەندی ێوانی واتای یەکەم و واتای دووەمی ووشە و دەربڕینەکانە . جگە لەم جیاوازییە هـەر سێ بابەتەکە لە بنەڕەتدا یەکن و هیچ شتێك لە یەکتر پچڕپچڕیان نـاکات : لە خوازەدا مەبەست لە دەربـڕین (جریوە و جـووکەی دارسـتان) واتـا زمانییەکەی نییە ، بەڵکوو ئاوەڵواتاکەیەتی کە (مەل و باڵندەیـە) ، لـە خواستندا (ئەدەب) ووشـەی (نـارنج)ی بۆ واتـای زمانییـەکەی بـە کارنەهێناوە ، بەڵام بۆ ئاوەڵواتاکەی سـازیکردووە کە (مەمـك)ە لـە درکەدا پەندی پێشینانی (لەگوێـی گادا نووستوون) واتـا زمـانییەکەی مەبەست نییە ، بەڵام بۆ ئاوەڵواتاکەی کە (غەفڵەتی و بێئـاگایی)یە بـە کارهێنراوە . جا لێرەدا دەبێ بپرسین : ئایە دەشێ لەبەر ئەو جیاوازییـە تاقانە و ڕووالەتیە ئەو ووشە و دەربڕینانە بە سەر سێ بابەتی سەرەکـیدا

---

(٢) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٩ .
(٣) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٩ .

دابەش بکەین و خەریکی داتاشینی زاراوەی سەیرسەیر بۆ سنوورکێشان لە نێوانیاندا بین ؟ .. ئایە شتێکی دیکە هەیە جگە لە سەپاندنی جیاوازیەکی ڕووکەشی و دەستکرد بە سەر دەربڕینی (جریوە و جووکەی دارستان) و (نارنج) و (لەگوێی گادا نووستن) ؟ !..

بۆچی مامۆستا کوردەکان لەو خالانە وورد نابنەوە کە ووشە و دەربڕینە (خوازە) و (خواستنە) و (درکە)یی یەکان یەك دەخەن ؟

مەبەستمان لەم پرسیارە سەرسوڕهێنەرانە دەستنیشانکردنی لاسایی کردنەوەی ئەو مامۆستا کوردانەیە دوورکەوتنەوەیان لە ڕاستەقینەی هونەری ئاوەڵواتا و پچراوییان لەم زانستە هاوچەرخاتەیەکە باسی ئەم هونەرە دەکەن . بۆیە ئێمە شوێنپێی ئەم مامۆستا کوردانە لە بابەتی چەشنەکانی ئاوەڵواتادا هەڵناگرین و دەگەڕێینەوە سەر تێڕووانینی تایبەتی خۆمان دەربارەی مەڵبەندی ووشە و دەپرسین :

ئایە سەرچاوەی ئاوەڵواتای ووشە و دەربڕین چییە و مەبەستیش لەم ئاوەڵواتایە دەبێ چی بێت ؟ هەروەکوو لەمەوبەر ووتمان مەڵبەندی واتاکانی ووشە و هەنگاوەکانی ژیانی هێزەکانی هۆشمەندییە ؟

کەوابوو ئاوەڵواتای ووشە و دەربڕین کە یەکێکە لەو واتایانە لە سەرچاوەیەکی یەکگرتووەوە هەڵدەقوڵێ ، مەبەستیش لە ئاوەڵواتا تێگەیاندنی گوێگر و خوێنەرە ، تێگەیاندنیش دوو هۆی هەیە کە ئامانجەکەیان یەکە :

هوێ یەکەم : دەربڕین لە شتێکی نوێ و تازەیە کە گوێ گر و خوێنەر پێویستیان بە ووشەیەك هەیە ڕوونی بکاتەوە و بوێ ببێ بە ناوێکی تایبەتی.

هۆی دووەم : دەربڕینە لە هەست و نەست و سۆزی دوێنەر و کارتێکردنە لە خوێنەر و گوێگر .

لەبەر تیشکی ئەم ڕاستیەدا ئاوەڵواتا بە لای ئێمەوە لە زمانی کوردی‌دا دوو چەشنی سەرەکی هەیە •

چەشنی یەکەم : ئاوەڵواتای فەرهەنگی‌یە •

چەشنی دووەم : ئاوەڵواتای هونەری‌یە •

## ئاوەڵواتـای فەرهەنـگی

لە زمان و ڕەوانبێژیی عەرەبی‌دا دەربارەی ئاوەڵواتای ئەو وشانـەی لە فەرهەنگ چەسپاون و لە قسەی ڕۆژانە بە سەربەخۆیی بەکاردەهێنرێن ، پرسیارێك بەرپا بووە پرسیویەتی :

ئایا مەبەست لەو ووشـانە واتا دێرینەکانیـانە یاخـود ئاوەڵواتـا تازەکانیانە ؟ •••

زۆربەی زانا دێرینەکان لەو بڕوایەدان کە ئەو ووشانە حەقائیقن و هیچ پەیوەندیەك لە نێوانی واتا تازە کانیان و واتا پیشووەکانیاندا نی‌یە : واتە ووشەی (الصوم) هەر بە مانای ڕۆژووگرتن هاتووە ، ووشەی(الصلاة): تەنیا بۆ نوێژکردن بە کاردێت و ئەم دوو ووشەیە هەرچی واتایان لە پێش ئیسلامدا هەبوو‌بێت نەماوون ••• مـامۆستا (مبـارك) کە زمانـەوانێکی عەرەبی هاودەمە ئەو هەڵوێستە دێرینەی کرد بە ڕێبـازێکی هاوچـەرخ و ووتی :

«ئەو واتایانەی کە بەسەر ووشەیەکدا دێن و لە دەوری خڕدەبنەوە بە یەکا دەچن و زۆران بازی‌یەك لە نێوانیاندا ڕوو دەدات ، سەرئەنجام واتـا نوێ کە واتا کۆنەکە و ئەوەی پێش ئەو دەسڕێتەوە و لە شوێنی‌دا خـوێ دەچەسپێنێ • بۆ نموونە ووشەی (البأس) بە واتای (تەنگی) و ، ووشەی (المسافة) کە لە بناغەدا (السوف)ە بە واتای بۆن و ، ووشەی (الحج) بـە

مانای (مەبەست) هاتبوون ، بەڵام ئێستا ئەم ووشانە تەنها بۆ واتا تازەکانیان بەکاردێن ، بۆیە ، (البأس) تەنها بە واتای (الحرب) و (المسافة) بە واتای (دوری) و ، (الحج) بە واتای (سەردان لە ماڵی خوا) هاتوون [٤] •

ئەم بیروڕایە ــ بێگومان ــ لە هەڵوێستێکی ئاینییەوە سەری هەڵداوە و هەموو تەقەلادانەکەی ئەوەیە کە ئەو ووشە قورئانیانە لە گوناەباری (المجاز) دوور بخاتەوە ، جا کە وابێ نازانین بۆچی مامۆستا کوردەکان خۆیان بەو هەڵوێستەوە بەستۆتەوە و بە هیچ جۆرێك سەرنجیان لەم چەشنە ئاوەڵواتایەیان نەداوە کە بەهرەی زمانی کوردی دەنوێنن و تایبەتی‌یەکی هەرە گرنگ لە تایبەتی‌یەکانی ئەم زمانە دەدرکێنن ؟! •
هەرچۆنێك بێت ئاوەڵواتای فەرهەنگی لە زمانی کوردی‌دا دەشێ بە یەکێك لەم دوو ڕێگایانەی خوارەوە لەدایكبووبێ :

یەکەم : ڕێگای داتاشین [٥] واتە سازکردنی ووشەیەك لە دوو ووشە یان پتر پاش ئەوەی دەنگێك یان زیاتر لە قەوارەکانیان فڕێدرابێ وەکوو ووشەی (مریشك) کە لە وشەی (مرو) ووشەی (وشکانی) پێك‌هاتووە و ووشەی (مەلیچك) [٦] کە لە ووشەی (مەل) و (بیچك) داتاشراوە •

دووەم : ڕێگای لێکدان کە لە دوو ووشە یان بەرەو ژورتر بە بێ ئەوەی لە دەنگەکانیان کەم بکرێنەوە ووشەیەکی نوێ ئەنجام‌دەدرێ وەکوو ووشەی (دەست‌کورت) کە لە ووشەی (دەست) و ووشەی (کورت) لێکدراوە ، ووشەی (بەردتێ‌گرتن) کە لە ووشەی (بەرد) و ووشەی (تێ) و (گرتن) بنیات‌نراوە ••• ئەگەر سەرنج لە فەرهەنگێکی کوردی بدەین بۆمان دەردەکەوێ کە بە هۆی ئەم دوو ڕێگایەوە ، زمانەکەمان بە پیت و

(٤) بڕوانە کتێبی (فقه اللغة وخصائص العربية) ل ٢٠٨ •
(٥) (داتاشین) : النحت •
(٦) (مەلیچك) : چۆلەکە لە زاری لوڕی‌دا •••

دەوڵەمەندبووە و دوێنەری کورد توانیویەتی لە هەموو کاتێك و شوێنێك بە جۆرێکی هونەری و زانستی بیروڕا و هەست و سۆزی خۆی دەربڕێ •

ئێمە لەو بڕوایەداین کە زمانەوانە کوردەکان ڕەنگە بەرهەڵستی ئەم بیروڕایە بکەن و بڵێن ئەم ووشانە هەریەك واتایان هەیە و نابێت تەماشای ووشە سادەکانیان بکەین ، ئەگەر لێیان بپرسین بۆچی ئەم ووشانە هەر یەك واتایان هەیە و نابێ تەماشای واتا ووشە سادەکانیان بکەین ؟ •••

بێگومان هیچ وەڵامێکی زانستیان نی‌یە جگە لە دووبارەکردنەوەی بیروڕاکانی مامۆستا (مبارك) و ئەوانەی کە لەسەر ڕێبازی مامۆستا (مبارك) ڕۆیشتوون •••

ئێمە دەبێ سەرنج لە سروشتی زمانی کوردی بدەین و لە چوارچێوەی ئەم سروشتەدا ووشە داتاشراو و لێکدراوەکانمان شی‌بکەینەوە ئاوەڵواتاکانیان وەکوو وێنەیەکی هونەری لەگەڵ واتا پێشووەکانی ووشەکاندا لێکبدەینەوە و بەراوردیان بکەین و بیسەلمێنین کە ئەم ئاوەڵواتایانە چۆن ئەرکێکیان لەفەرهەنگی کوردیدا بەدی‌هێناوە • بۆ بەڵگە با چەند ووشەیەك لەم ڕووەوە یەکالا بکەینەوە و بیروڕاکەمان دەربارەی ئاوەڵواتای فەرهەنگی بچەسپێنین :

ووشەی (چاو) کە لە هەموو گیاندارێك‌دا ئەندامی بینینە لەگەڵ دەیان ووشەی تر لە بۆتەی زمانی کوردیدا لێکدراوە و ئاوەڵواتای فەرهەنگی هێناوەتە بەرهەم : لەم ووشانە ووشەی (باز) کە لەگەڵی‌دا ووشەی (چاوبازی) سازداوە ئەم ووشەیە ئاوەڵواتاکەی (چاوباشقاڵ)ە بەهۆی ووشەیەکی نوێوە ئەنجام دراوە کە هەردوو ووشە سادەکانی : (چاو) بە مانای ئەندامی بینین و (باز) بە مانای چەشنە باڵندەیەك وێنەیەکی تازە پێش‌کەش دەکات و واتایەکی سەربەخۆ لە فەرهەنگی کوردیدا دەنوێنێ ،

لەم وێنە و واتایەدا ئەو دوو ووشە سادانــە هەرچەندە سێبــەری مانــا پێشوەکانیان هێشتا لە گەڵیاندایە و جۆرە قەوارەیەك بە ئاوەڵواتای ووشە لێکدراوەکە دەدەن ، بەڵام لە هەمان کاتدا لە چوار چێوەی ئەم دارِشتنــە نوێ‌یــەدا تواونەتەوە و رِێگایان بە ووشەی (چاوباز) داوە کە بێتە ســەر لیستەی ووشە داهێنراوەکانی فەرهەنگی کوردی •

ئا بەم پێ‌یە دەتوانین ووشەی (چاوبرسی) و (چاوبەست) و (چاوپیس)و (چاوترسێن) و ، چەندەها ووشەی تر کە لە ووشەی (چاو) و ووشەیــەکی دیکە لێکدراوون شی‌بکەینەوە و ئاوەڵواتاکانیان و واتــا پێشووەکانیــان بەراوورد بکەین • بزانین چۆن ئەم ووشە لێکدراوانە کاردەکەنــە ســەر دەروون و هەستی گوێ گر و خوێنەر و یادگاریان لەگەڵ ووشە سادەکانیان زیندوو دەکەنەوە •

ووشەی (چاو) لە مەڵبەندی گوێ گر و خوێنــەری کورد کە هێــزە هۆشمەندیەکانیەتی بە مانای ئەندامی بینین چەسپاوە ، ووشەی (برسی) بــە مانای پێویستی بە خواردەمەنی هاتووە ، هەردوو ووشــەکە کە لــە یــەك دراون (چاوبرسی) : ئاوەڵواتای باری کەسێك نیگار دەکێشێ کە بەرچاوی لە هەموو شتێکدا تەنگ بێت و بە هەڵپە بێت • ئەم ئاوەڵواتایــە کە لــە فەرهەنگی کوردیدا بە واتایەکی تازە تۆماردەکرێ پەیوەندی‌یــەکەی لــە مەڵبەندی ماناکانی وشەی (چاو) و وشەی (برسی) هەڵدەقوڵێ و گوێ گر و خوێنەری کورد کە ئەو وشەیە دەبیستێ یەکسەر یــادی مانــا پێشووەکانی ووشە سادەکان دەکاتەوە و بە وردی لە ئاوەڵواتاکە تێ‌دەگات • هەروەهــا ووشەی (چاوبەست) : (چاو) بە هەمان مانای پێشــوو هــاتووە ووشــەی (بەست) لە مەڵبەندی ژیانی‌دا لە هێزە هۆشمەندی‌یەکانی گوێ گری کورد بە مانای گرتنی شتێك بە هۆی شتێکی‌ترەوە • ئەمجا هەردوو ووشەکە کــە

لەیەك دراوون ئاوەڵواتای : هەڵخەڵەتاندنی یەکێکی لە کارێکا پێ‌سازدراوە و دوێنەری کورد ئەم ئاوەڵواتایە بە چەندەها ڕستە دەدرکێنێ وەکوو : ئـەم قسانەی تۆ (چاوبەست)ن ، فیسار کەس پیاوێکی (چاوبەست)ە •

ووشەی (چاوپیس) کە بە ئاوەڵواتای حاڵی کەسێك هـاتووە ئەگەر هات و چاوی بە هەر شتێك هەڵهێنێ زیانی پێ دەگەیەنێ ، لە کەرەسـەی (چاو) لەگەڵ ووشەی (پیس) سازکراوە ، هەروەها ووشەی (چاوترسێن) کە برینی‌یە لە گەورەیەك لێی پترسێ ، بێگومان مەرج نی‌یـە (چـاو)ی ئەو گەورەیە هۆی ترسەکە بێت ، بەڵام ووشەی (چاو) هەروەکوو لە ووشـە لێکدراوە پێشووەکاندا بینیمان سەرچاوەیەکی بە خـوڕە بۆ سـازکردنی ئاوەڵواتای فەرهەنگی لە زمانی کوردی‌دا و زمانەوانەکانیش نابێ لەمەودووا فەرامۆشی ئەم سەرچاوەیە بکەن و ڕەخنەسازەکانیش لـە شی‌کردنـەوەی ئاوەڵواتا و فەرهەنگی‌یەکان نابێ لەم ڕێبازە لابدەن و ئەرکی ئەم چەشنـە ئاوەڵواتایە لە هونەری ووشەسازیی کوردی‌دا پشت‌گوێ بخەین •••

## ئاوەڵواتـای هونەری

هەندێ ووشە و دەربڕین بە هوێ بـە کارهێنانیانـەوە لـە ڕسـتەدا ئاوەڵواتایەك بۆ واتا پێشووەکانیان دەدەن بە دەستەوە ، وامان بەباش زانی ئەم جۆرە ئاوەڵواتایە بە ئاوەڵواتـای هونـەری ناو ببـەین • جیـاوازیی سەرەکیی نێوانی ئەم چەشنە و چەشنەکەی پێشوو واتـە : (ئاوەڵواتـای فەرهەنگی) ئەوەیە : ئاوەڵواتای فەرهەنگی خۆی لە خۆی‌دا ئاوەڵواتـاکەی دەنوێنێ و پیویستی بە ڕستەیەك نیە بۆ دەرخستنی واتا تایبەتی‌یـەکەی ، کەچی ئاوەڵواتای هونەری ئەگەر لە ڕستەدا نەبێت گـوێ‌گر و خوێنـەر بە هیچ کلۆجێك نازانن مەبەست لەو ووشەیە ئاوەڵواتا هونەریەکەیەتی • بۆ نموونە ئێمە کە ووشەی (داوێن‌پاك) دەبیستین یەکسەر و ڕاستەوخۆ تێدەگەین

کە مەبەست بە ئابڕووی و بە شەرەفی‌یە و واتا جیا بە جیای هەردوو ووشەگە (داوین و ، پاك) بە جۆرێکی میکانیکی نی‌یە ، بەڵام ووشەی گوڵ ئەگــەر هات و بە تەنها و بە بێ ڕستە ووترا بۆ گوێ گر و خوێنەر هەیە کە سووربن لەسەر ئەوەی بۆ واتای ڕووەکێك بە کارهێنراوە ، ئەگەر هات و جگە لــەم واتایە مەبەست بێت دەبێ بە هوێ ڕستەیەکەوە ئەو مەبەستە دەست‌نیشــان بکرێت • ئەحمەد رەشوانی دەڵێ :

**گوڵ لەبۆ دڵدار ، ئەبێ بە دیاری**
**بیکات بە چەپك و ، بیبا بۆ یاری**
**تا لەپاش مەرگیش گوڵی زەردوسوور**
**هەر پێویست ئەبێ ، بۆ سەر مەزاری**

لەبەر تیشکی ڕستەکانی ئەم پارچە هۆنراوەیە خوێنــەر و گوێ گــر تێ‌دەگەن کە مەبەستی هەستیار لە ووشەی گوڵ‌ئاوەڵواتــا نی‌یە بەڵکــوو مەبەستی ئەو گوڵەیە کە ئەیناسین و بۆ دەربڕینی هەستی خۆشــەویستی و لە شایی‌دا بە کاری دەهێنن • بە پێچەوانــەی ووشــەی گوڵ لــەم دێــڕە هۆنراوەیەدا کە دەڵێ :

**جار لە داخی (گوڵ) ، جار بۆ (گوڵ) ئەگریم**
**وەك بولبول بێ (گوڵ) ، لەسەر چڵ ئەگریم**

ئاشکرایە کە مەبەستی هەستیار لە ووشەی (گوڵ) لە دەربڕینی (جار لەداخی گوڵ) و دەربڕینی (جار بۆ گوڵ) ئەگریم) واتا ناسراوەکەی نیە • هەروەها دڵدار کە ووتوویەتی :

**گەڕاوە سینەکەی تارم ، ئەویستاش ئەی (گوڵی) غەمگین**
**لە تەنهایی سەرینت بێ ، دە هانێ ئەم دڵە توخوا**

بە هوێ ووشەی گوڵەوە ئاوەڵواتــای خۆشەویســت و دوڵبــەری چەسپاندووە •

ئێمە کە زاراوەی (ئاوەڵواتای هونەری)مان بۆ ئەم چەشنە ئاوەڵواتایە سازکردووە ویستوومانە سەرنج بۆ ئەرکەکـەی لە گەیانـدنی بیرۆکـە و ئەندێشەی وێژەر ڕابکێشین و بیسەلمێنین کە ئەم ئەرکە درکاندنی بیرۆکە و ئەندێشەی وێژەر بە شێوازێکی سادە و ساکار و ڕاستەوخۆ نییە ، بەڵکوو بە هۆی تابلۆیەکی گیاندار و وێنەیەکی زیندووە ئەنجام دەدرێ ، ئەم چەشنە ئەنجامدانەش بێگومان کارێکی هونەرییە ، چونکە پێویستی بە ووردەکاریەکی بەهرەدار و سروشتی هەیە • (شوکری) کە ویستوویەتی بیروڕای خـۆی دەربارەی بناغەکانی ئیشێکی گشتیی سەرکەوتوو بچەسپێنێ و لە هەمـان کاتیش‌دا سۆزی مەترسی و هیوای تایبەتی خۆی لـەم ڕووەوە بدرکـێنێ ووتویـەتی :

ئیش کە ڕووی ئێستە لە هەورازە سەرەو لێژی نەکەی
بیری ووردیشی ئەوێ هەر بە دوعا و نوێژی نەکەی

ئەم هەستیارە مەزنە لەم دێڕەدا نەی‌ووتووە ئیشی گرنگ لەگەڵ دوعا و نوێژ پێویستی بە بیرکردنەوە و لێکدانەوە هەیە بۆ ئەوەی سەربکەوێـت و نەبەزێت و لە تێك‌چوون بپارێزرێ ، بەڵکو بـیرۆکەی ئیـش و سـۆزی خۆشەویستی بەرامبەری بە تابلۆیەکی گیانـدار و وێنەیـەکی زینـدوو و قەوارەدارکردووە و لەسنووری کارێکی واتایی یەوە دەری پەڕانـدووە و خستویەتی‌یە ناوجیهانی گیان‌دارانەوە • بەم جۆرە گوێ‌گر چاوی لە ئیشە وا بەسەر هەورازدا سەر دەکەوێت و ئارەقی ماندوویەتی و بڕینی ڕێگا بـە ناوچەوانیەوەیەتی گوێی لە هەناسە بڕکێ‌یەتی و ڕەنگە لێی‌ببیستێ کە دەڵێ ئۆخەی وا سەرکەوتم ، بەڵام ئاگاتان لێم‌بێت گلۆر نەبمەوە خوارەوە • ئـا بەم پێوەرە دەتوانین چۆنیەتی دەربڕینی (پیرەمێرد) لە باری مەلولی و بـێ

تاقەتی بە هوێ ئاوەڵواتای هونەری ووشەی (وەنەوشەوە) شیبکەینەوە ، کە ووتوویەتی :

**دار و گیا و گیاندار پڕ نەشئە و دڵخۆش**
**من و وەنەوشە ملکەچ و شینپۆش**
**ئەو پابەندی خاك کۆنە هەواران**
**من دڵبەندی خاك مەزاری یاران**

(پیرەمێرد) گەر بیویستایە بە هۆی بەراوردکردنی بارە تایبەتییەکەی لەگەڵ واتا ناسراوەکەی ووشەی (وەنەوشە)دا بە خوێنەرانی ڕابگەیەنێ کە بێزار و خەفەتبارە هەرگیز لە بەدیهێنانی ئەو ئەرکەدا سەرنەدەکەوت ، چونکە خوێنەران کە ئاشنایییان لەگەڵ (وەنەوشە) وەکوو گوڵێکی جوان و بۆنخۆش هەیە هەست و سۆز و بیریان بۆ ئەو بارەی پیرەمێرد نەدەچوو ، بۆیە هەستیار پەنای بردە بەر ئاوەڵواتای (وەنەوشە) و بە ڕەنگ و دەنگ و بزووتنەوەی تابلۆیەکی تایبەتی بۆ سازکرد و وای لە خوێنەرانی کرد کە هەست بە (وەنەوشە) بکەن وەکوو گیاندارێکی ملکەچ لە خەفەتدا شینپۆش لە ماتەمدا و بێتاقەت و هێزلیبڕاو دەستەوئەژنۆ لە کۆنە هەوارانا .

گەر لێرەدا بپرسین (پیرەمێرد) چۆن بوێ هەبوو سروشتی (وەنەوشە) وەکوو گوڵێکی جوانبگۆڕێ و لەو بەرگە خەمبارەدا بینوێنێ و بیکا بە هاوباری خۆی ؟ ..

ڕەخنەسازی بەناوبانگ (ا. ا. رتشاردز) کە ئاوەڵواتا دەناسێنێ و دەڵێ : «ئاوەڵواتا هیچ نییە جگە لەوە نەبێت کە هۆیەکە لە دەربڕینی هەڵوێستی دوێنەر دەربارەی ئەوبابەتەی لێیدەدوێ»[7] ڕەنگە لەم پێناسەیەدا وەلامی ئەو پرسیارە بەدی بکەین : هەستیار بە چاوێکی

(٧) کتێبی (مبادیء النقد الادبی) ل ٣٠٩–٣١٠ .

ڕەش‌بین و دڵێکی پڕ لەخەفەت دەڕوانێتە (وەنەوشە) ئەمجا بە زمانی ئەندێشە کە ئاوەڵواتایە سەرنجە تایبەتی‌یەکانی وەکوو چەند ڕاستی‌یەك دەدرکێنێ و دەیانخاتە قالبی زمانێکی هونەری‌یەوە کە ئاوەڵواتای وشەکانی بڕبڕەیەتی •

ئەوەی لێرەدا پێویستە دوپاتی بکەینەوە : ئەندێشە هێزێکە لە هێزەکانی هۆشمەندیی ئادەمیزاد کارگەی خوڵقاندنی ئاوەڵواتایە و لە مەڵبەندی تۆمارکردنی واتاکانی ووشە لە مێشکدا ئەم ئەرکە ئەنجام دەدا ، چونکە ئەندێشە هەر وەکوو لە جیهانی ڕەخنەسازیدا چەسپاوە : (هۆی لەدایك‌بوونی وێنەی ڕوونە و هێنانەوەی ئەو وێنە بینراوانەیە) [٨] •

وێنەی ڕوون و وێنەی بینراویش بە ڕێگای ئاوەڵواتاوە سازدەدرێ • بۆ نموونە با سەرنج لە ووشەی (دڵ) بدەین بزانین چۆن ئاوەڵواتاکانی لە چەند دێڕێکی جۆربەجۆردا بە هۆی ئەندێشەوە لەدایك‌بوون و لە فەرهەنگی زمانی هونەری کوردیدا چەسپاوون •

وشەی (دڵ) لە زمانی ڕۆژانەدا بۆ واتای پارچەیەکی تایبەتی لە لەشی ئادەمیزاد بەکارهێنراوە ، ئەم پارچەیەش هەروەکوو ئەحمەد ڕەشوانی دەڵێ :

**دڵ لە لای ئێوە کوپەڵەی خوێنە**
**بەڵام بۆ دڵدار پیرۆزترین شوێنە**

کەوابوو دڵ لە لای خەڵکی سەرچاوەی خوێنە و بە هۆیەوە خوێن لە لەشی ئادەمیزاددا گەڕدەخوا ، بەڵام هەستیاران بە زمانی ئەندێشە چەند ئاوەڵواتایەکیان بۆ ئەم ووشەیە خوڵقاندووە :

(ئەدیب) ووشەی (دڵ) لەبری ئادەمیزاد بەکار دەهێنێت و دەڵێ :

---

(٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٠٩ـ٣١٠ .

**(دڵ) بە مەیلی خۆی دەمێکە عاشقی باڵاتە**
**توخوا مائل بە غەیری خۆت و بێگانەی مەکە**

(بێ‌کەس) ئەم ئاوەڵواتایەی (دڵ) زیاتر ڕوون دەکاتەوە و وێنەیەکی وای بۆ دەکێشێ کە بەدڵدار و مەفتوون و سەرخۆش بێتە بەرچاو ، بۆیە دەڵێت :

**(دڵ)ێ لە خۆیا دائم تەڕ نەبێ**
**سەرخۆشی بادەی ڕووی دولبەر نەبێ**
**مەفتوونی باڵای قەد عەرعەر نەبێ**
**بە جامێ شەراب کەیل و مەست نەبێ**
**ساخوا ئەم (دڵ)ە دایم پەستی‌کەی**

لە هەڵبەستێکی کەدا مامۆستا (فائق بێ‌کەس) (دڵ) بە گیانداریکی مەیلەو ئاواز و دەنگ‌خۆش لە قەڵەم دەدا و دەڵێ :

**(دڵ) زۆر موبتەلای دەنگ و نەغمەتە**
**توخوا قەتارێ (دڵ) بۆت لەت‌لەتە**

(حەریق) لەسەر هەمان ڕێباز دەڕوات و بە ئەندێشە ئاوەڵواتایەکی تر بۆ دڵ سازدەدات و دەڵێ :

**لەشکری ئاهم لەگەڵ جەیشی حەبەش دەعوا ئەکا**
**حیرەتم ماوە کە چۆن ئەو دڵبەرە (دڵ) می ڕفاند**

کەوابوو (دڵ) شوێنی خۆی لە سنگی ئادەمیزاددا بەجێ‌دەهێڵێت و دوای خۆشەویست دەکەوێت • (دڵدار) ئەو ئاوەڵواتایەی وشەی (دڵ) وەردەگرێت و دەڵێ :

**دڵ وەدوو ئەفسانە کەوتوو وای‌ئەزانی وا ئەبێ**
**ئیشی دونیا ڕەنجی پێناوێ ، بە خۆی کۆتا ئەبێ**

ئا بەم جۆرە تا دێ ئاوەڵواتای هونەری ووشەی (دڵ) لە پەرەسەندنا دەبێت و فەرهەنگی هۆنراوەی کوردی دەوڵەمەند دەکات •

(دڵدار) دیسان دەڵێ :

**ئەمان مردم لە داخی (دڵ) لەبەر گریان و هاواری**
**درێغ سوتام لە قرچەی ئاگری ئێشان و ئازاری**

لەم دێـڕەدا (دڵ) وەکـوو بێگانـەیەك خـاوەنەکەی سـزا دەدات و ئێش و ئازاری پێدەگەیێنێ ، (زێوەر) بێگانەیی (دڵ) لە خاوەنەکەیەوە زیـاتر دەخاتەوە ڕوو دەڵێ :

**سەر و ریشەکەم بوو بە بەفر و کەچی (دڵ)**
**چ منداڵە بۆنی دەمی شیری خاوە**

سەرەنجام ئێمە لە شیکردنـەوەی ئاوەڵواتـاکانی وشـەی (دڵ)دا شوێن پێی مامۆستاکانی پێشوومان هەڵنـەگرت و نەمـانووت (دڵ) لـەو دێرانەدا خوازەی بەرەڵایە و بەپەیوەندی بە کارهێنانی پارچە لەبری هەموو بە کارهێنراوە ، بەڵکوو دەڵێین گشت ئەو ئاوەڵواتانـەی ووشـەی (دڵ) لەگەڵ واتا دێرینەکەی بە هوێ ئەندێشەوە لە مەڵبەندی ووشە لە مێشـکی ئادەمیزاددا تۆمارکراون هەستیاریش هەر ئاوەڵواتایەکیان بـە کاربهێنێـت یاخود ئاوەڵواتایەکی نوێ بخوڵقێنێ و بیخاتە سەریان دەتوانێ کار بـکاتە سەر سۆزی گوێگر و خوێنەر و هەستی بجوڵێنێ ، چونـکە گوێگر و خوێنەر پەروەردەی هەمان زمانن و لە گەڵ چێژی نەتەوایەتی ئەم زمانـە ئاشناییان هەیە •

# علم المجـــاز

## من النقد الأدبى اليونانى والرومانى والعربى والاوروبى الى الدراسات البلاغية الكرديـــة

## عرض وتلخيص :

المقرر الثابت في تاريخ الشعر الكردي : أن ماوصل الينا من تليده قد ترعرع رواده تحت خيمة الاسلام فكرا وعقيدة ، وتأثر مبدعــوه بالثقافــة العربية من بين ماتأثروا به ، وتتلمذ السائرون به لثمار اللغــة العربيــة قرآنا كريما واحاديث نبويه وفنونا ادبيه فى شتى العصور والبيئات •

ولعل الباحث المدقق اذا ما أراد أن يشير الى اوائل هذا الشعر ، ينبغي عليه ان يتجاهل حديث النحل والوضع ، ويذكر شاعرين هما (خليل المندلجي) المتوفى سنة ٢٠ هـ (٦٤٠ــ٦٤١م) و (بابـــا روخ الهمداني) الذي عاش في القرن التاسع الميلادي ومات في آب ٨٤١م •

اما اذا اعتمد التاريخ الصحيح فله أن يستقبل (بابـــا طاهر الهمداني) ٩٣٥ــ١٠١٠م أول شاعر كردي تصح رباعياته مستنبطا لفنون القول • وبعد هذا الشاعر فاضت آثار شعراء من أمثال علي الترموكي ، ومــلاي جزيري وعلي حريرى وفقى طيران واحمدى خانى وسيدى هورامــانى و مولـــوى وسواهم من الشعراء الذين رسخوا تقاليد الشعر الكردي القديم بلهجاتـــه الرئيسة : (الكرمانجية الشمالية والكرمانجية الجنوبية والگورانية واللورية)•

ثم بنوا تقاليده من الوان البيان تشبيهات ومجازات واستعارات وكنايات •

وتواصل الشعراء المعاصرون والمحدثون خلفا عن سلف فتوارثوا هذه التقاليد وتقيلوا تلك الاساليب ، فتكررت الصور الفنيه فى قصائد حاجى قادر كويي واحمد مختار جاف وحمدي صاحب قران وپيرەميرد وفائق بىكەس وجگرخوين وگوران وكامران موكرى متلونة بظلال التجديد التى لم تهد من قواعد أبنيتها اللغوية معاني حقيقية ومدلولات مجازية وعلاقات عقلية وذوقية تشد فيما بين هذه المدلولات وتلك المعاني الى جانب قرائن لغوية وحالية ترشد اليها وتكشف عن مكامنها •

ويلحظ الباحث المدقق ايضا : أن منبت الشعر الكردي الاصيل لم يحترز من يد التقليد جهلا في التراث ومشايعة للاثر الاجنبي ، فطأطأ في زاوية منه جانبه لقصائد شعراء شباب فتحوا قلوبهم لما ترجم من آثار المدارس السريالية والرمزية واللامعقول الاوربية فخرجوا على الصور البيانية الاصيلة • ومن هنا فان الباحث البلاغي يلمس في الشعر الكردي القديم والحديث ظاهرتين متناقضتين :ـ

اولاهما : جريان جماهير هذا الشعر في ألوان المجاز وأنواعه فنا له قواعده وأصوله •

وثانيتهما : جموح طائفة منه عما تقرره اللغة ويحرره الذوق في ميدان التعبير الفني فاذا هي رموز ومعميات لاتفك المعاجم طلاسمها ولايهتدي العقل الى مراميها •

لقد دعتنا هاتان الظاهرتان الى دراسة علم المجاز تفهما وتبينا لاولاهما ، وجنة واحترازا من ثانيتهما •

واذ كانت حلبة الصراع والتنابذ بين الاصالة والتقليد تتسع للعلم والذوق والاجتهاد والتعنت ، رأينا أن تستوي هذه الدراسة تاريخية تحليلية

موازنة ، فطرقنا باب النقد الادبي اليوناني والروماني لنعرف حال دراسة المجاز في شجرته •

ومما ظهر لنا من هذا الطرف : أن الادب الملحمي والاسطوري اليوناني الذي صور الالهة بشرا يحبون ويكرهون يحقدون وينتقمون قد أثار حفيظة الفلاسفة الذين نعوا عليه الكذب في تعابيره وأساليبه ، فانبري السوفسطائيون حماة لهذا الادب وقرروا : ان هذه الاساليب والتعابير ليست حقائق لغوية ، وانما هي رموز ومجازات وتصدى ارسطوطاليس للسوفسطائيين في زعمهم هذا وقرر : أن اللفظة المجازية لاتؤول هوى وميلا ، وانما تنهض على واحدة من أربع قواعد : هي (انتقالها من الجنس الى النوع أو من النوع الى الجنس أو من النوع الى النوع أو بحسب التمثيل) •

وهكذا فقد ولد علم المجاز عند اليونان في مجالين :

أولهما : متسع بلا حدود وبلا قواعد أفرط السوفسطائيون في مد آفاقه لاسباب سياسية واجتماعية •

وثانيهما : مختنق أمعن ارسطوطاليس في ضم أطرافه وللمة أركانه لعلل فلسفية ومثالية •

ثم التقينا في الدراسات النقدية الرومانية بالشاعر والناقد هوراس ، فرأيناه يشبه الالفاظ في اللغة بالاوراق في اشجار الغابة ، ويتيح للشعراء أن يجددوا في معانيها وصياغاتها وفق ضوابط يسيرة مادام هناك داع يدعوهم الى الجديد ، فكان بذلك مقلدا لارسطوطاليس في دراسته الشعرية •

وبعد (هوراس) مررنا بالباحث الروماني (لون جينوس) فوجدناه ينكر المجاز على فن النثر ويرتضيه لفن الشعر فى ايماءات واشارات لم تستو دراسة منهجية •

ان النتيجة التي تمخضت لنا من تتبع علم المجاز في الدراسات اليونانية والرومانية هي : ان القائمين بهذه الدراسات قد نزعوا في مباحثهم عن نظرات فلسفية وفكرية ، مما رأيناهم لايقيمون هذا العلم على قواعد وضوابط يؤدي عنها استقراء النصوص ومحص الشواهد .

لقد تلمسنا علم المجاز في الاثار العربية منذ عصر ماقبل ظهور الاسلام، فنبهنا الى ان الكلمة العربية في هذا العصر قد ترسخت اصول دلالاتها لغة وعقلا وشعورا ، فكان على الاديب أن يديرها وفق هذه الاصول ، والا فان الجمهور العربي في الاسواق والمنتديات والمناسبات الخاصة كانوا يأخذون عليه تنكبه هفوة لغوية وفنية .

وبين يدي القرآن الكريم وماجرى من تفسير لآيه البينات وبيان احكامه ثبتنا أن اللغة العربية التي نزل بها هذا الكتاب العزيز الحكيم قد ازدهرت كلمها وتعابيرها على جذورها العريقة فأثمرت في الآيات البينات ثلاثة أنواع من المجاز :

اولها : المجاز العقدي الذي نهضت شواهده في التعبير عن ذات الله وصفاته جل وعلا .

وثانيها : المجاز الدلالي الذي تجسدت نماذجه في الكلمات العربية المؤدية عن المعاني الجديدة في شتى شؤون الحياة الاسلامية .

وثالثها : المجاز الفني الذي صور أمثلته الحكم الاسلامية للتأثير والتوجيه. لقد استخلصنا من النظرات الخصبة والدراسات الجادة للنصوص الدينية والادبية العربية : ان مصطلح المجاز قد أداره لاول مرة الجعد بن درهم (١١٨هـ) متعرضا لمسألة خلق الانسان فأكسبه صبغه كلاميه جدليه . ومن هنا فقد تتبعنا الاتجاه المناقض لاعتماد مصطلح المجاز ، ووقفنا عند

سيبويه (١٨٨هـ) الذي احصى من انواع التعابير مايستقيم لفظه ولا يصدق معناه منوها بالاسلوب المجازي الذي يفرط في المبالغة كذبا •

كما وقفنا مع من انتهجوا هذا السبيل من امثال محمد ابن كرام وابن حزم وابن تيميه (٧٢٨هـ) وسواهم من الذين انكروا ورود فن المجاز فى القرآن الكريم والأحاديث النبوية الشريفة •

مما لاريب فيه ان هذا الاتجاه في انكار المجاز ــ رد فعل معاكس ، وعليه فقد أشرنا الى ما أثاره : وهو اتجاه فلسفي فرض المدلولات المجازية على النصوص الدينية بلا قواعد وبلا ضوابط ، فسجلنا : ان علم المجاز قد وجد لنفسه رغم هذا كله تربة خصبة فمد جذوره وارتفع سوقه واخضوضرت أوراقه واينعت ثماره الاصيلة في استقراء ابي عبيدة لألوان المجاز القرآني وفي بيان الفراء والاخفش الاوسط لمعاني القرآن ، كما ترسخت مناهجه في مصنفات ابن المعتز وعبدالقاهر الجرجاني وابي هلال العسكري ومن نحا نحوهم من العلماء الادباء الذين درسوا المجاز تعبيرا لغويا له قواعده ، وحللوا أضربه فنونا لها أصولها •

وبعد هذا ملنا متخففين على جمود الدراسة المجازية لدى طائفة من الباحثين الذين تحزموا بالمنطق في دراساتهم ، فانتهوا بعلم المجاز العربي الى قواعد متحجرة •

ان النتائج التي تواترت في بحثنا لعلم المجاز ــ تراثا عربيا ــ متنوعة نوهنا من بينها بما يؤكد : أن هذا التراث يمدنا بمنهج لغوي استقرائي وفني ذوقي يصلح لدراسة علم المجاز اذا ما أحسنا مراعاة متطلبات التطور والخصوصية في النصوص التي ندرسها •

لقد أثارت هذه النتيجة في بحثنا سؤالا يلم بعلم المجاز في النقد الادبي الكردي مستفسرا عن وجهته ومناهجه وهو تتشكل قواعده على أيدي باحثين

معاصرين يقفون لدى مفترق الطرق بين التراث العربي والدراسات النقدية الاوربية التي تنهض تاريخا وتطورا على اسس بحث المجاز اليوناني والروماني ، ولهذا فقد أسهبنا في تتبع مناهج علم المجاز بين مصنفات هاتيك الدراسات ، ففرزنا جملة من الظواهر ابرزها :ــ

الخلط بين المجاز والتشبيه كما يقول الناقد الانكليزي (جرستيان) وانكار (وندت) و (كلينر) لورود المجاز في اللغة ، وقصد (هربت ريد) للمجاز على فن الشعر ، وتمزيق (جورج كامبل) بحث المجاز بين اللغويين والنقاد .

وبعد هذا رسمنا مناهج علم المجاز عند الاوربيين معتمدين دراسة الناقد الانكليزي (كرستيان بروك) الذي قسم هذه المناهج الى مجموعتين :
اولى المجموعتين : المناهج الفلسفية التي هي اربعة انماط :

اولها : نمط ارسطو في بحث المجاز وتقسيمه على أساس الجنس والنوع .

وثانيها : نمط الحي والجماد الذي يتتبع اصحابه انتقال الكلمة من معناها الحقيقي الى مدلولها المجازي على أسس النقل من الحي الى الجماد ومن الجماد الى الحي ومن الحي الى الحي ومن الجماد الى الجماد .

وثالثها : النمط الفكري الذهني الذي يستضيء متقبلوه بالايحاءات الشعورية .

ورابعها : نمط العلاقة المشتركة المركزية الذي يفترض السائرون في ضوئه : ان الاشياء كلها تلتقي في صفة متعاورة فيما بينها مما يحق للاديب أن ينقل الكلمات الدالة عليها ويستعملها مجازا لاي مدلول يشاء .

وثانية المجموعتين : المناهج اللغوية التي تدور على اجزاء الكلام

الخمسة في اللغات الهندوأوربية ، فهي على هذا مناهج خاصة بهذه اللغات، وان كانت في الوقت ذاته ينزع أصحابها منزعا فلسفيا في تحليل المجازات وتوجيهها •

واذن فان الدراسات الاوربية لاتقدم لعلم المجاز المنهج الرائد ، وانما تتركه مشاعا بين الفلسفة واللغة والنقد والبلاغة ويأتي الباحثون الاكراد أثر هذه الرحلة الطويلة لعلم المجاز ليجدوا بين أيديهم موروثا ضخما متنوعا من الاتجاهات والمناهج ، والسؤال هو الى أي شيء انتهوا ؟ •

المعروف : أن موضوعات البلاغة والفصاحة عامة اذا كانت قد وجدت لمصطلحاتها فسحة في الشعر الكردي القديم ، وان الشاعر الناقد الشيخ نوري الشيخ صالح اذا كان قد فسر طائفة من هذه المصطلحات في معرض نقدي متخصص قبل زهاء نصف قرن ، بيد أنها لم تجد طريقا الى البحث المتكامل المستفيض الموروث باللغة الكردية •

ولعل الاستاذ الشيخ علاءالدين السجادي هو أول مؤلف باللغة الكردية دنا من القضايا البلاغية وعالج موضوع المجاز في الآونة الاخيرة ، فترجم المصطلحات البلاغية الى اللغة الكردية وبسط مجمل مسائلها وأورد بعض شواهدها •

وفيما يتعلق بجهده المشكور بعلم المجاز : أنه قد استقى من بعض المراجع العربية المتأخرة ونقل مصطلحات البيان نقلا حرفيا شكليا ، وفصل بينها ، ومال عن الخطة المقررة في دراستها خالطا بين المجاز والاستعارة في شرح الشواهد اليسيرة التي ترجم بعضها والتقط بعضها الاخر من النصوص الكردية •

وتقبل الدارس الناشيء السيد عزيز گەردي خطوات الشيخ علاءالدين السجادي ، فلم يفد من المصادر العربية الاصيلة في الدراسات البلاغية ،

مما رأيناه يترجم الى اللغة الكردية مباحث البلاغة من الكتب المدرسية المعاصرة .

وتعرض الدكتور عبدالرحمن الحاج معروف للمجاز ضمن دراسته اللغوية للكلمة الكردية ، فتوقعنا أن يستوي تعرضه ذا تتائج علمية تعوض المكتبة الكردية مافاتها في هذا الميدان الهام ، ذلك لانه متخصص ويطلع على الدراسات الاجنبية بالاضافة الى وقوفه على التراث العربي ، ولكن توقعنا لم يغننا عن الشروع في دراسة علم المجاز باللغة الكردية بدءا ليست له خلفية علمية ينهض عليها بهذه اللغه .

ولعل نتائج بحثنا تتمثل في أننا قد نحتنا مصطلحا كرديا جديدا يؤدي عن مصطلح المجاز العربي والميتافور الاوربي ، وينبه الى أن الظاهرة المجازية ليست تعبيرا طافيا ينتقل من المعنى الحقيقي للكلمة المعجمية الى المدلول المجازي في صورة آلية شكلية وانما هي عملية شعورية تجري في مكمن الموروث اللغوي لدى الاديب ويجري على قلمه لوحة يمتزج فيها المعنى اللغوي والمدلول المجازي بالمشاعر والأحاسيس .

ومن هذا المنطلق لم نجزيء موضوعات البيان الرئيسة : (المجاز والاستعارة والكناية) وانما تناولناها وحدة متكاملة تحت ذلك المصطلح ، كما أننا استقرأنا النصوص الكردية التي تقلبت على مفهومنا الجديد المتسع للمجاز فاستنتجنا أن اللغة الكردية تعتمد في مجال التعبير والتأثير نوعين من المجاز هما المجاز اللغوي والمجاز وبالاضافة الى هذا لم نحلل المجاز في شاهد شعري أو نثري منقطع عما يمتد معه في النص الذي ورد فيه ، وانما دعونا الى تجاوز هذا المنهج التقليدي بدراسة المجاز في النصوص التي تعاورت على موضوع موحد وأدت عنه .

وبديهي أن بحثنا يستوي خطوة أولية على النهج القويم الى دراسة علم

المجاز غايته الرئيسة هي الكشف عن قواعد فهم الظاهرة المجازية في الموروث الادبي الكردي من جهة والاخذ على أيدي الذين يتجاهلون هذه القواعـد باسم التجديد والتطوير من جهة اخرى آملين أن تتلوها خطوات أخرى •

**كامل حسن البصير**

بغداد ١٩٨١/٨/٤

# سەرچـاوە

ا ــ سەرچاوە کوردی‌یەکان :

١ ــ ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی • مامۆستا علاءالدین سجادی • چاپخانەی مەعاریف ١٩٦٨ •

٢ ــ خۆشخوانی : مامۆستا علاءالدین سجادی • چاپخانــەی مەعــاریف ١٩٧٨ •

٣ ــ رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا • مامۆستا عەزیز گەردی •

٤ ــ (نرخ‌شناسی) مامۆستا علاءالدین سجادی • چاپخانەی مەعاریف بغداد ١٩٧٠ •

٥ ــ ووشەی زمانی کوردی • دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف چاپخانەی کۆڕی زانیاری کوردی ــ بەغدا ١٩٧٥ •

ب ــ سەرچاوە عەرەبیەکان :

١ ــ الادب اليونانى القديم : الدكتور على عبدالواحد وافى ــ مطبعة دار المعارف ــ مصر ١٩٦٠ •

٢ ــ الاتقان فى علوم القرآن : جلال‌الدين السيوطى • مطبعة الحجازى ــ القاهرة •

٣ ــ ارسطوطاليس فى الشعر : القنائى ابو بشر متى بن يونــس ــ مصر ١٩٥٣ •

٤ ــ الايمان : ابن تيمية ــ مطبعة المكتب الاسلامى دمشق ١٣٨١ ك ــ ١٩٦٠ •

٥ ــ تاريخ الفلسفة اليونانية : يوسف كرم •

٦ ــ فقه اللغة وخصائص العربية : محمد المبارك ــ الطبعه الثانيه ١٩٦٤ ــ مطبعة دار الفكر الحديث ــ لبنان •

٧ ــ (الفصل فى الملل والاهواء والنحل) : ابن حــزم ــ الطبعــة الاولى ١٣٤٧ك ــ مطبعة محمد على صبيح ــ مصر •

٨ ــ فن الشعر : ارسطوطاليس ــ ترجمة : دكتور عبدالرحمن بدوى ــ مطبعة النهضة المصريه ١٩٥٣ •

٩ ــ فن الشعر : هۆراس ، وەرگێرانی دكتــۆر عبدالرحمــن بــدوى ، چاپخانەی النهضة المصرية ، ١٩٥٣ •

١٠ــ محاضرات فى اللغة : دكتور عبدالرحمن ايوب ــ مطبعة المعــارف بغداد ١٩٦٦ •

١١ــ معانى القرآن : الفراء ــ الطبعة الثانية ــ ١٣٧٤ك ــ ١٩٥٥ ز • مطبعة دار الكتب المصرية •

١٢ــ مبادىء النقد الادبى : ا• ا• ريتشارد •

١٣ــ النقد : اسس النقد الادبى الحديث : وەرگێرانی : هيفــاء هــاشم ، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری دمشق ١٩٧٦ ز •

١٤ــ الكتاب • سيبويه •

١٥ــ مشكل القرآن : ابن قتيبه •

١٦ــ نظرية الأدب : رينيه ويليك : ترجمة : محي‌الدين صبحي ــ مطبعة خالد الطرابيش ١٣٩٢ك ــ ١٩٧٢ •

١٧ــ مناهج البحث في اللغة : دكتور احسان عباس •

١٨ــ اللغة : ج : فندريس : ترجمة عبدالحميد الدواخلي و محمد القصاص مطبعة لجنة البيان العربي •

ج ــ سەرچاوە ئینگلیزیەکان :

1— Grammar of Metaphor. Christine Brooke — Rose.

2— The Koran. Translated by E. F. Palmer, Oxford University Press, 1949.

3— The Problem of Style. by F. Middleton Marray, Oxford University, Press, London 1960.

4— English Prose Style. by Herbert Read. G. Belland Sons Ltd., London, 1956.

# نـــاوەڕۆك

| بـابەت | لاپـەڕە |
|---|---|
| سیمانتیك و ئاوەڵواتا | ٩١ |
| مەڵبەندی وشە | ٩٢ |
| زاراوەی ئاوەڵواتا بۆچی | ٩٤ |
| چەشنەکانی ئاوەڵواتا | ٩٦ |
| ئاوەڵواتای فەرهەنگی | ١٠٠ |
| ئاوەڵواتای هونەری | ١٠٤ |
| علم المجاز من النقد الادبی الیونانی والرومانی والعربی والاوروپی الی الدراسات البلاغیة الکردیة ـ عرض وتلخیص | ١١١ـ١١٩ |
| سەرچـاوە | ١٢٠ـ١٢٢ |

**نرخی ( ٣٠٠ ) فلسە**

**لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا**
**ژمارە ١٠٨٩ی ساڵی ١٩٨١ی دراوەتێ**